تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

# میکۆنۆس

بکوژانی
شەرەفکەندی
ریسوا
دەکا

منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردي - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com

لوقمان مەهفەر

٢٠٠٧

# پێناسی کتێب

کتێب: میکونووس بکوژانی شەرەفکەندی ڕیسوا دەکا

بابەت: لێکۆڵینەوەی یاسایی

نووسینی: پارێزەر لوقمان خورشید عەبدولڕەحمان

پیتچنین: قادرو گەلاوێژ مێهفەر

مونتاژ: شەفیع ڕەوشەنی

دیزاینی بەرگ: بەهرام

ژمارەکان: ۱۰۰۰

ساڵی چاپ: ۱۳۸٦ی هەتاوی (۲۰۰۷ی زایینی)

# پێرست

٢) جیاوازی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی و چالاکی بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکان

**بەشی سێهەم**

**تیرۆریزم وەك دیاردەیەکی نێودەوڵەتی**

**بەندی یەکەم:**

هەوڵەکانی بنبڕکردنی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لە لایەن ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان

بەندی دووهەم: هەڵوێستو بیروڕای نێونەتەوەیی سەبارەت بە تیرۆریزمی نێودەوڵەتیو هەوڵەکان بۆ ریشەکێشکردنی

١) هۆلەند

٢) ئارژانتین

٣) لیبی

٤) کوێت

٥) ئەمریکا

٦) یەکیەتیی سۆڤییەت

**بەشی چوارەم "تاوان، لێکۆڵینەوە"**

**بەندی یەکەم:**

ـ قاسملوو لە تریبوونی کۆنگرەی ئەنتەرناسیونالی سوسیالیست"دا هەوڵی نێونەتەوەیی کردنی کێشەی کورد دەدا

ـ مێژووی ژیان و بەسەر هاتی قاسملوو

ـ لە بیرەوەری شەوی یەڵدادا

ـ شەرەفکەندی ژیانو تێکۆشان

ـ دیسان تاوان

ـ شەرەفکەندی بۆ دیالۆگ نەك بۆ مەرگ

- بەرەو کۆبوونەوەی ئۆپۆزیسیۆن

- چۆنیەتیی كارەساتێكی دوور لە یاسا

**بەندی دووهەم:**

- چارەسەری كێشەكە لە روانگەی یاسای نێوخۆیی ئاڵمان
- پرس و لێكۆڵینەوە سەرەتایییەكان
- چۆنیەتی لێكۆڵینەوە لە دۆزی میكۆنوس
- زانیاری یەكانی بریتانیا بەڵگەی بەهێزن بۆ پۆلیسی ئاڵمان
- ئیقرار و ئێعتراف بە تاوان دەكرێ

**بەندی سێیەم**

- دابینكردنی عەدالەت، یا پاراستنی بەرژەوەندییەكان
- پەیامی دەفتەری سیاسی حیزبی دێموكراتی كوردستانی ئێران
- میكۆنووس بۆمێژوو

## بەشی پێنجەم: "هەڵوێستی ئاڵمان"

**بەندی یەكەم:**

- دادگای جینایی ئاڵمان "میكۆنووس"
- لە بەرلین قازی سەربەستەو، یاساسەروەرە
- حوكمی جەلب "گرتن"
- هەڵوێستی حكومەتی ئاڵمان

**بەندی دووهەم:**

- دوو روانگەی جیاوازلەسەرحوكمی فەلاحیان
- حوكمێكی مێژوویی "لە قەزادا بێ وێنەیە"
- پارلمانی ئاڵمان

## بەشی شەشەم

### هەڵسوکەوتی دەوڵەتان بەرامبەر بە کێشەکە

**بەندی یەکەم:**

- دژکردەوەی ئێران
- کۆتاییهاتنی دیالۆگی رەخنەگرانە
- ئەمریکا تەنبیدی بڕیاری میکۆنووس دەکا

**بەندی دووهەم:**

- ئۆپوزیسیۆنی ئێرانی
- کەسایەتیيەکان
- گوڵبژێرێك لە پەیام و هەڵوێستی ڕێکخراوە سیاسییەکان

## بەشی حەوتەم

### هەڵوێستی یاسای گشتی نێودەوڵەتی سەبارەت بە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی "اغتیالاتی سیاسی"

**بەندی یەکەم:**

- تیرۆرانینی چەند کەسایەتییەکی خاوەن را

**بەندی دووهەم:**

- پرنسیپەکانی یاسای گشتی نێودەوڵەتی
- سەرەنجدان بە خاڵێك لە یاسای گشتیی نێونەتەوەیی

**بەندی سێهەم:**

شەرەفکەندی بۆ نموونە

ئاسەواری دادگای میکۆنووس لە بواری حقوقی قەزایی نێونەتەوەیییەوە

# پێشەکی

دوو خاڵی سەرەکی بوونەتە هۆی نووسینی ئەم باسە:

یەکەم: ئەو باسە پەیوەندی بە مەسەلەی کوردەوە هەیە. کورد نەتەوەیەکە کەخۆی و نیشتمانەکەی بە پیلانێکی نێودەوڵەتی لە نێوان چوار وڵاتدا دابەش کراوە بە هەموو جۆرێك زوڵمی لێ دەکرێ. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم ئازارانە گەلێکی نەبەزیوە، کۆڵنەدەرە. لە بەرامبەر ملهوڕی و سەرەڕۆیی‌دا چۆکی دانەداوە، غەدریی زۆری لێ کراوە، رۆڵەکانی ئاوارە کراون، لە سەر ماڵ و حاڵیان دەرکراون، کیمیا باران وئەنفال کراون و بە پیلانی نامرۆڤانە و دوور لە رێوشوێنی نێونەتەوەیی سەردارانی لە سێدارە دراون، لە سەرمێزی وتووێژەکان بە دەستی دوژمنانیان کوژراون. بەڵام لە هەموو ئەم رووداوانەداو لە گەڵ هەڵکێشانی ئاه و حەسرەت ئەزموونی بە نرخی لێ وەرگرتوون. لە خەبات و تێکۆشان نەپرینگاوەتەوە و سڵی نەکردوە. ئەگەر (فرزندە)[1] لە تاران و جەعفەر ئاغای شکاك لە تەورێز و سمکۆی[2] برای لە شاری شنۆ بە فێڵ بانگ کران و تیرۆر کران. ئەگەر بە بەڵێن و وادەی بەدرۆ چوونە نێو شاری مەهاباد[3] و پێش هەموو کەس پێشەوا قازی محەممەدیان گرت و لە سێدارەیان دا، چەند رێبەرێکی تری کورد لە پارچەکانی دیکەی کوردستان بەو جۆرە گیانیان بەخشی، کەس لە دنیای مرۆڤایەتی‌دا باسی لێ نەکردن و بە

---

[1] بەچکە شێرانی کورد، نووسینی عوسمان خواکەرەم ـ زرنگ چاپ. دەزگای رۆشنبیری وبڵاوکردنەوەی کوردی. زنجیرەی ژمارە ۱۷۳ لاپەرە ٦٧

[2] کوردستان و کورد نووسینی د.عبدالرحمن قاسملوو، و. عبداللە حەسەن زادە، چاپی ۱۹۷۳ لاپەرە ۸٦

[3] چل ساڵ خەبات نووسینی د.عبدالرحمن قاسملوو چاپی ۱۳٦٤ لاپەرە ۸

مەسەلەیەکی نێوخۆیی سەیریان دەکرد. بینیمان کە دوکتۆر قاسملور لە سەر مێزی وتووێژ بە دەستی دیپلۆماتە تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی لە ویەن تیرۆر دەکرێو دەوڵەتی ئوتریش لەبەر بەرژەوەندییەکانی ئابووری چاوی لە راست ویژدان دا دەقوچێنێ، بەلاّم لە ناکامی لێکۆڵینەوەی قەزایی ئاڵمان لە دۆزی میکۆنووس واتە تیرۆرکردنی دوکتۆر شەرەفکەندی بوو بەهۆی ئەوە کە ئیەتەو بۆچوونی کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ هەموو ئەو کەسانە کە بیر لە ئازادی مرۆڤ دەکەنەوە و رێز لە یاسا دەگرن روون بێتەوە و پەردە لە سەرتاوان و جینایەتەکانی هەڵدریتەوە، بە جۆرێک کە بیرورای گشتی مرۆڤایەتی نەیتوانی لە بەرامبەریدا بێ دەنگ بێ و لەگەڵ دەربڕینی بێزاری، هەڵوێست و سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامی ئێرانیشی مەحکوم کرد بەوەی کە تاوانی ئەو جۆرە کەسانەی دەبێ تیرۆربکرێن چیە؟ جگە لەوەی ئاواتی ئەوان تەنیا  ئازادییە و بەدەست هێنانی ماف و ئازادیەکانی ئینسانی بۆ ئەوان بە تاوان دەژمێردرێ. لە حاڵێکدا ئەوان ئاوارەن لە زێدو نیشتمان، دوور لە سنوورەکانو لە سەر خاك و لەژێر حاکمیەتی ولاّتێکی دیکەدا دەستدرێژی دەکرێتە سەر گیانیانو تیرۆر دەکرێن.

دووەم: گرنگی و بایەخدان بە باسەکەیە: پێم وایە ئەو باسە کەمی لەسەر نووسراوە چونکە دیاردەی تیرۆر پێویستە زۆر زیاتر لەوە کەهەیە  لەسەری بنووسرێ و حەقە کە توێژینەوەی زانستی یانەی لەسەربکرێ و ئەوکەسانە کە زمانەکانی بێگانە دەزانن، شارەزای یاسان لەگەڵ لێکۆلەرەوان و مێژوو نووسان دەبێ زیاتر کاتی خۆیان بۆ ئەم جۆرە باسانە تەرخان بکەن، بۆ ئەوەی مێژووی میللەتەکەیان دەوڵەمەند تر بکەن، تا ئەسلی داهاتوو ئەو مێژوویە بخوێننەوە و فێری بن، دوژمنی سەرەکیی خۆیان بناسن و لە هەڵوێست و کردەوەکانیان ئەزموون وەرگرن.

ئەم باسە باسێکە کە لە کولیەی قانوون لە ژێر ناوی "بەرپرسایەتیی دەوڵەت لە تیرۆری سیاسی لە ئاستی یاسای نێونەتەوەییو یاسای نێوخۆییدا، شەرەفکەندی بۆ نموونە"

پێشکەش کراوە بە زانکۆی سەلاحەدین، لە لایەن خوێندکاری بەشی یاسا (لوقمان خورشید عەبدولڕەحمان "مێهفەڕ")، لە ژێر سەرپەرستیی دکتور عەبدولفەتاح عەبدولڕەزاق مەحموود لە ساڵی ۲۰۰۵ی زایینیدا، پاشان لە سەر پێشنیاری هێندێك لە دۆستان، پێشنیار کرا بکرێ بە کتێبو تەکمیلتر بکرێو پێشنیاری کورتکردنەوەی ناوەکەشی کرا کە لە کۆتاییدا بوو بە "میکۆنووس بکوژانی شەرەفکەندی ڕیسوا دەکا".

گرفتەکانی نووسینی ئەو باسە:

۱) نەبوونی سەرچاوە بەگوێرەی پێویست.

۲) سەرچاوەکان کە هەن بە زمانی بیانی نوسراون. بۆ ئەوکەسە کە زمانی بیانی نەزانێ موشکلە. سەرەرای ئەوەش. ئەو سەرچاوانەش زۆر کەمن لە کوردستان. ئەوەی هەیە لە دەرەوەی وڵاتە. وەدەست کەوتنی بۆ ئێمە مانان زەحمەتە.

۳) وەزعیەتی ئێستامان جۆرێکە کە لە وڵاتی خۆمان دا نین. بۆیە لەوبارەشەوە کەمتر دەستمان بە سەرچاوە رادەگا. لەو شوێنەش کە نیشتەجێین بە زمانی ئەو وڵاتەش شارەزانین. بۆیە ناچار زۆرتر تەئکیدم کردۆتە سەر سەرچاوە کوردیەکان و فارسی‌یەکان.

ئەو سەرچاوانەی کە لە باسەکەدا زۆرتر پشتم پێ بەستوون:

۱) کتێبی "تیرۆری نێو دەوڵەتی".

۲) گۆڤاری "یاسا" ، ژمارە ۷ و ۸ .

۳) رۆژنامەی "کوردستان" ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران.

٤) کتێبی "سەفەری بێگەرانەوە" لە نووسینی خوالێخۆشبوو کاك سەلام عەزیزی.

٥) "کورتە مێژووی حیزبی دێموکرات" لە نوسینی دوکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملوو و عبدالله حەسەنزادە.

٦) "هنوز در برلین قازی هست"، لە نووسینی میهران پایەندە ، عەبباس خوداقولی، حەمید نۆزەری

٧) سووڕەت جەلەسەکانی دادگای میکۆنووس

دیارە چەند سەرچاوەیتریش لەو بارەوە موتالا کراون، کە لە لاپەرەکانی ئاخری باسەکەدا بە وردی نووسراون.

باسەکە بە سەر حەوت بەشی سەرەکی دا دابەش دەکرێ.

بەشی یەکەم میژوو و پێناسەی تیرۆرکە لە دوو بەند پێکهاتووە:

بەندی یەکەم: میژووی سەرهەڵدانی تیرۆر

بەندی دووهەم: پێناسەی تیرۆر

بەشی دووهەم تیرۆریزمی نێودەوڵەتی کە لە سێ بەند پێك هاتووە:

بەندی یەکەم: فاکتەرەکانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی

بەندی دووهەم: شێوازەکانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی

بەندی سێهەم: تایبەتمەندی یەکانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی

بەشی سێهەم: "تیرۆریزم وەك دیاردەیەکی نێودەوڵەتی" کە لە دوو بەند پێك هاتووە:

بەندی یەکەم: هەوڵەکانی بنبڕکردنی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لە لایەن ڕێکخراوە نێودەوڵەتی یەکان.

بەندی دووهەم: هەڵوێست و بیرورای نێونەتەوەیی سەبارەت بە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی و هەوڵەکان بۆ ریشەکێش کردنی.

بەشی چوارەم "تاوان و لێکۆڵینەوە" ئەم بەشە دەکرێتە سێ بەند. بەندی یەکەم. باس لەوە دەکا کە دوو سەرکردەی کورد لە کۆنگرەی ئەنترناسیونالی سوسیالیست دا بۆ باس

لەسەر چارەسەری کێشەی کورد بەشداری دەکەن. بەڵام دوای تەواوبوونی کۆنگرە هەردووك ڕێبەر لە لایەن تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە تیرۆر دەکرێن.

لەبەندی دووەم دا: باس لەچارەسەری کێشەکە دەکرێ لە ڕوانگەی یاسای نێوخۆی ئاڵمان. دەزگای قەزایی ئاڵمان دەست بە لێکۆڵینەوەی سەرەتایی دەکا. لەو پرس و لێکۆڵینەوەدا بۆی ڕوون دەبێتەوە کە ئەم قەتلە قەتڵێکی ئاسایی نیە.

بەندی سێهەم: دەزگای قەزایی ئاڵمان بەپێی ئەو بەڵگانەی لە بەردەستی دا بوون دەگاتە ئەو ئاکامە کە تاوانەکە دەستی دەرەکی لە پشتەوەیە و دەبێ ئەولایەنە ناوی بێ و دەزگای قەزایی ئاڵمانیش عەدالەتی خۆی بنوێنێ.

بەشی پێنجەم "هەڵوێستی دەوڵەتی ئاڵمان" کە لە دوو بەند پێك هاتووە. بەندی یەکەم، باس لە ڕەسمیەت دانی دادگا و ئامادە بوونی شاکی یەکان. و پارێزەرەکان و تاوانباران و پارێزەرەکانیان دەکا.

بەندی دووهەم، باس لە خۆشحاڵی‌و ڕێزگرتنی حیزبی دێموکرات لە قەزایی ئاڵمان دەکا سەبارەت بە گرتنی ئەو هەڵوێست و دانی ئەو بڕیارە واقیعی و عادیلانەیە، ئەمە لە لایەك لەلایەکی دیکەوە دژ کردەوەی ئێران بە نسبەت ئەو بڕیارەو دەست کردن بە تۆمەت لێدان و هەڕەشە وپەلەقاژە کردن.

بەشی شەشەم هەڵسوکەوتی دەوڵەتان بەرامبەر بە کێشەکە:

کە لە دوو بەند پێك هاتووە بەندی یەکەم، باس لە دژ کردەوەی ئێران دەکا بە نیسبەتی مەسەلەکە، بیرو ڕای گشتی لەسەر ئەو بیروڕایە کە دەبێ دیالۆگی ڕەخنەگرانە لەگەڵ ئێران کۆتایی پێ بێ، ئەمریکا تەئیدی بڕیاری دادگای میکۆنوس دەکا.

لەبەندی دووهەم دا: باس لە هەڵوێستی ئۆپوزیسیونی ئێرانی و کەسایەتی یەکان دەکرێ سەبارەت بە کێشەکە، و گوڵبژێرێك لە پەیامی ڕێکخراوە سیاسی یەکان ئێو ئاخنی باسەکە کراو.

بەشی حەوتەم هەڵوێستی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی سەبارەت بە تیرۆری سیاسی کە لە سێ بەند پێك هاتووە:

بەندی یەکەم: تێڕوانینی چەند کەسایەتییەکی خاوەن ڕا.

بەندی دووەم: پرەنسیپەکانی یاسای گشتیی نێونەتەوەیی و سەرنجدان بە خاڵێك لە یاسای گشتیی نێونەتەوەیی.

بەندی سێیەم: شەرەفکەندی بۆ نموونە و ئاسەوارەکانی دادگای میکۆنووس لە بواری حوقووقی قەزایی نێونەتەوەیی یەوە.

لەکۆتاییدادەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکە.

ناکرێت لێرەدا ئەوەش لە بیر کەم کە بە گەرمی سوپاس و پێزانینی خۆم پێشکەشی گشت ئەوبەرێزانە بکەم کەهەر یەك بەپێی کات و توانای خۆی هاوکار بوون لە دەرچواندنی ئەم کتێبەدا، بەتایبەتی:

١ـ بەرێز دکتۆر حاکم هیمداد عەلی مەجید، پارلمانتارو پارێزەر، بەرێز تارق محەمەدسەعید جامباز، پارلمانتارو پارێزەر، بەرێز کەریم بەحری برادۆستی کە هەر سێکیان پێداچوونەوەیان لە بواری یاساییەوە لەسەر کردو تێبینییەکانیان خستەروو.

٢ـ بەرێز کاك حەسەن شەرەفی، جێگری سکرتێری گشتیی حدکا، پێداچوونەوەی لە بواری زمانەوانییەوە کردوە.

٣ـ مۆنتاژ: شەفیع رەوشەنی.

٤ـ دیزاینی بەرگ: شۆڕش غەفووری.

٥ـ دوو لە جگەرگۆشەکانم قادرو گەلاوێژ لە پیتچنینی بابەتەکاندا یارمەتییان داوم.

# دەسپێك

دادگـای میکۆنـوس کـه لـه دۆسـییەی تـیرۆری سیاسـی "دوکتـۆر محەمـەد سـادق شـەرەفکەندی" سـکرتێری گشـتیی حیزبـی دێمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران و هاورێکـانی دەکۆڵێتەوە، بۆ ماوەی زیاتر لە سێ (٣) ساڵە سەرنجی بەشێکی زۆر لـە بـیروڕای گشـتی جیهانی بۆ لای خۆی راکێشا بوو.

کۆماری ئیسلامیی ئێران لە ماوەی دەسەڵاتداریەتیی خۆیدا تـا تـیرۆری ١٩٩٢/٩/١٧ی بێرلین جگە لە نێوخۆی ئێران، تەنیا لـە دەرەوەی ئێـران ٥٠ کـردەوەی تیرۆریسـتی بـە دژی نەیارانی خۆی ئەنجام داوە کە لەو کردەوانەدا ٨٠ کەس کوژراون. بەڵام ئەوە یەکەم جـار بـوو کە لە دادگایەکی ئێشتمانیی خاوەن متمانەدا دەکەوتە بەردەم دادبینـی و تاوانـەکانی لـەقاو دەدران. هەر بۆیە بەحەق لە لایەن هەموو ئۆرگان و ئـۆرگانی دادپـەروەری و مـافی مرۆڤـەوە بایـەخێکی زۆر بـەو دادبینی‌یـە دراوە و هـەموو لا بـە پەرۆشـەوە چـاوەڕوانی رەوتـی بەرەوپێشچوون و ئاکامە یاسایی‌یەکانی بوون.

دادگای میکۆنوس لە بێرلینی ئاڵمان زیاتر لە سێ ساڵ و نیوی کێشا. لەو ماوەیەدا ٢٤٦ تا ٢٤٧ دانیشتن کرا. ١٦٦ تا ١٧٠ کەس بۆ شایەدی بانگ کرابوون. بە پێـی سەرچـاوەیەك خەرجی ئەو دادگایە لە دەوروبەری ٩ میلیۆن مارك دایە[1].

ئەوەی لە بیرەوەریی هەمووماندا زیندویـە، تـەنیا ئەوەیـە کـە دادگـای میکۆنـوس لـە کۆبوونەوەی رۆژی (١٠ی ئاوریلی ١٩٩٧)ی خۆیـدا بـە بڕیـارێکی ئازایانـە و دادپەروەرانـە، رێبەرانی کۆمـاری ئیسـلامیی ئێرانـی لـە بـەرزترین پلـەی دەسـەڵاتداریدا وەك عـامیلانی دەرکردنی فەرمانی تیرۆری دکتۆر شەرەفکەندی، رێبـەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە دنیا ناساند و حوکمی زیندانیشی بۆ چـەند کەسـێك لەوانـەی دەسـتیان لـە بـەرێوەبردنی فەرمانی تیرۆرەکەدا ببوو دەرکرد.

---

[1] رۆژنامەی "کوردستان" ئۆرگانی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ژمارە ٢٤٤ لاپەرە ٢١

# بەشی یەکەم

## مێژوو و پێناسەی تیرۆر

### بەندی یەکەم:

### مێژووی سەرهەڵدانی تیرۆر

ئەگەر تیرۆر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووریو ئایینی بێ، بێگومان بە پێی رەورەوەی مێژووی مرۆڤایەتی، تیرۆریش بە شێوەی جیاجیا لەلایەن تیرۆریستانەوە پەیڕەو کراوە، بۆ مێژووی سەرهەڵدانی تیرۆریش راوبۆچوونی جیاجیا هەیە. هەندێ لە لێکۆڵەرەوەکان مێژووی سەرهەڵدانی دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی گریکەکان (یۆنانییەکان)و رۆمانییەکانو لەلایەکیترەوە، هەندێ لە شارەزایانی ئەو بوارە، مێژووی سەرهەڵدانی تیرۆر دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی ١٧٨٩ی زایینی کە (رۆبسپیرو سان جۆستو کۆسۆن) لە ماوەی حوکمڕانیاندا بە شێوەیەکی نامرۆڤانە ئەو کردەوە نامرۆڤانەشیان دژی خەڵکی فەرەنسا بەرێوە دەبردو پاشان حوکمی مردنیان لەسەر جێبەجێ کردن. بەو شێوەیە بۆ یەکەم جار لە فەرەنسا وشەی (تیرۆرو تیرۆریستان) بەکار هات، هەرچەند هەندێ لێکۆڵەرەوەی ئەو بوارە پێیان وایە کە مێژووی سەرهەڵدانی تیرۆر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەلافەتی عوسمان کوڕی عەففان. بەڵام دەتوانین بڵێین هەر لەو کاتەی ململانێی سیاسی دەستی پێکردوە بۆ گەیشتن بە کورسیی دەسەڵات لە لایەنی بەرامبەرەوە هەوڵ دراوە جلی جۆراوجۆر بکەنە بەر مەرامەکانیان بۆ ئەوەی هەر کاتو زەمەنێك رەواجی بێ، لە ئارادا بووە بۆ چەواشەکردنی کۆمەڵانی خەڵك ئەو بەرگەی بەبەردا براو، جا مەرامی ئایینی، مەزهەبی، رەگەزپەرستی یان کۆنەپەرستی بێ.

هەرچەند هەندێك لە مێژوونووسەکان سەرەتاکانی سەرهەڵدانی تیرۆر بۆ سەدەی یەکەمی زایینی دەگەڕێننەوە (بۆ جولەکەکانی زیلون) لە فەلەستین کە هەوڵیان دا سوپای رۆمانی بە رێگای تیرۆریستی و لە رووداوی جیاجیادا تێك بشکێنن.

(لە راستیدا بەکارهێنانی هەر دوو چەمکی تیرۆریزم لە فەرهەنگی سیاسیی سەردەمەکاندا لە دوو قۆناخی مێژوویی جیاوازدا سەریان هەڵداوە. دەکرێ سەرهەڵدانی شۆڕشی فەرەنسا لە ساڵی ١٧٨٩ بە سەرەتای بەکارهێنانی وشەی "تیرۆریزم" لەقەڵەم بدرێ.)[٢]

سەرەتای شۆڕشی فەرەنسی بە قۆناخی تیرۆری شۆڕشگێڕی (ارهاب الثوری) ناسراوە کە بە سەرکردایەتیی (رۆبسبیر) بوو، بەڵام ئەوانەی سەرپەرشتیی ئەو قۆناخەیان دەکرد، رۆژێك هات خۆیان کەوتنە بەر (مقصلە.)[٣]

دوای رووخاندنی دەسەڵاتی (رۆبسبیر) لە فەرەنساو لە سێدارەدرانی لە ساڵی ١٧٩٤دا، ئەنجامێکی راستەوخۆی لە سەر بەکارهێنانی وشەی تیرۆر هەبوو. ئەم رووداوە گرینگە لە مێژووی فەرەنسادا بووە هۆی بڵاوبوونەوەی وشەی Terrorisme.[٤]

مێژووی سەرهەڵدانی تیرۆر دەگەڕێننەوە بۆ دوو قۆناخی جیاجیا لە شۆڕشی فەرەنسا، قۆناخی یەکەم لە ١٠ی ئوت تا ٢٠ی سێپتامبری ١٧٩٢ی زایینییە. قۆناخی دووهەم ئەو کاتەیە کە ژاکۆبییەکان دەسەڵاتدار بوون تا ٥ی سێپتامبری ١٧٩٣.[٥]

<u>بەندی دووهەم: پێناسەی تیرۆر</u>

---

[٣] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ٩٩

[٤] مامۆستا گیلانی سیداحمد ، گۆڤاری پارێزەر ، ژمارە ٧ ، شوێنی چاپ هەولێر ، ساڵی ٢٠٠٤ ، ل ٢٨ – ٣٧

[٥] مافپەروەر کمال رمزا احمد ، گۆڤاری مافپەروەران ، ژمارە ١٥ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، ساڵی ١٩٩٩ ، ل ٤٥

[٦] غولامرەزا علی بابایی ، فرهنگ علوم سیاسی ، تهران ، شرکت نشر و پخش ویس ، ساڵی ١٣٦٩ – ١٣٦٥ ، ل ١٣٦

وشەی تیرۆر پێك هاتووە لە وشەیەکی لاتینی (Terr(ere بەمانای هەست بە ترس کردن. لە مێژووی شۆڕشی فەرەنسەدا ئەو وشەیە مانایەکی تایبەتی هەیەو دوو مەبەست دەپێکێ: یەکەم، بە مانای بیرکردنەوەو تەکبیر کردنو هەڵبژاردنی شێوازەکانی دژوار لە دژی بەرهەڵست کارەکان (ضد انقلابیون).

دووهەم: ناوی قۆناغەکانە کە لە مێژووی شۆرشی فەرەنسەدا کە لەو قۆناغەدا تیرۆر بە مانای یەکەم بەکار هاتووە، حاکم بووە.[6]

لە بنەڕەتدا چەمکی تیرۆر لە وشەی Terrerی فەرەنسییەوە هاتووە، ئەویش لە ئەسلی لاتینی Terrere -Terseree‌وە داتاشراوە کە مانای ترساندنو دڵەڕاوکێ یاخود تۆقاندن دێت.[7]

تیرۆر: بریتیە لەو کردەوە ترسناکەی کە خەڵك دەتۆقێنێو ئامانجەکەی ناڕەوایە، یا چەك بە ناڕەوایی دەکاربهێندرێ، چونکە دەست لە کەس ناپارێزێو هەر کەس بکەوێتە بەردەستی دەیکوژێو هەر شتێك بکەوێتە بەر دەستی کاولی دەکات.[8]

ئا) پێناسەی تیرۆر لە رووی زمانەوانییەوە

لە رووی زمانەوانییەوە فەرهەنگی ئەکادیمیای فەرەنسی ساڵی ١٦٩٤ بەم شێوەیە راڤەی کردوە (تۆقاندن، ترسێکی توند، تێکچوون، وێرانکردنی شێوازێکی توندوتیژانە لە شێوەی شەڕەنگێزیەکی هەنوکەیی یاخود مەترسییەکی نزیك).[9]

[7] غولامرضا علی بابایی، فرهنگ علوم سیاسی، تهران، شرکت نشر و پخش ویس، سالی ١٣٦٩ – ١٣٦٥، ل ٣٧٦

[8] تۆفیق عمر محمد، سامان احمد محمود، زانا جلال سعید، گۆڤاری یاسا، ژمارە ٧-٨، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢، ل ٩٨

[9] د. محمد احمد گەزنەیی، گۆڤاری ئەمڕۆ، ژمارە ٢١ – ٢٠، شوێنی چاپ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٤، ل

[10] تۆفیق عمر محمد، سامان احمد محمود، زانا جلال سعید، گۆڤاری یاسا، ژمارە ٧-٨، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢، ل ٩٨

مانای تیرۆر بەم پێیە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە خودی سایکۆلۆژییەتی تاکەکانەوە هەیە، ئەو پرۆسەیە بارودۆخێکی وەها دەخولقێنێ کە فشارێکی توند دەخاتە سەر دەروونی گشت تاکەکان لەئاکام دا قالبێکی سۆسیۆلۆژیانەش لە خۆ دەگرێ کە تێکڕای کۆمەڵ بە یەك شێواز لەو بارودۆخە نائارامەدا دەژین.

ئەگەر بەراوردێکی زمانەوانی بۆ هەردوو چەمکی تیرۆرو تیرۆریزم لە نێوان زمانی عەرەبیو فەرەنسیدا بکەین، دەبینین کە لە زمانی فەرەنسیدا هەریەك لەو چەمکانە خەسڵەتێکی دیارون هەیەو لە دوو قۆناخی مێژوویی‌دا سەریان هەڵداوە، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا دەبینین چەمکی تیرۆر بە مانای (ذعر ـ رعب ـ رهبە) دێت، هەروەك چۆن بە مانای (ارهاب/تیرۆر)یش دێت، چەمکی تیرۆریزمیش هەمان مانای لێ دەکەوێتەوە، بۆیە دەکرێت بڵێین کە چەمکی تیرۆریزم (ارهاب) لەزمانی عەرەبیدا گشتاندنی (رهبە)یەو ڕوانگەیەکی گشتگیرترە.[١٠]

١) پێناسەی تیرۆر لە زمانی کوردیدا

لێدانی لە ناکاو بۆ لەناوبردنی نەیارو دروستکردنی دڵەڕاوکێ لە نێو خەڵکدا بە پێی بەرنامەیەکی لەپێشدا دیاریکراو کە خۆی لە قەتڵی بەئەنقەستدا دەنوێنێ.

٢) پێناسەی تیرۆر (ارهاب) لە زمانی عەرەبی:

تیرۆر لە زمانی عەرەبیدا یانی ترساندنو، رهبە یانی ترسانی، ناوی فاعیل لە ئەرهەبە مورهیبو، ناوی فاعیل لە رەهبە رەهیبیو رەهەبوتو مەرهوب (رهبوت خیر من رحموت) یانی ترسناك بێ باشترە لەوەی خەڵك دڵی پێت بسووتێ.[١١]

ب) پێناسەی تیرۆرلە شەریعەتی ئیسلام و فیقهی ئیسلامیدا

١) لە شەریعەتی ئیسلامدا:

[١٠] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

[١١] د . محمد احمد گەزنەیی ، ارهاب ، شوێنی چاپ هەولێر ، چاپخانەی زانین ، ساڵی ٢٠٠٤ ، ل ١٠

وشەی ئیرهاب لە قورئان دا نەهاتووە، بەڵام وشەی (رهبو راهبو ارهب) چەند جار لە قورئان دا هاتووە بە مانای جۆراوجۆر.

١ـ (رهب) یانی ترساو خۆی لیّ لادا

٢ـ (راهب) یانی لە خوا ترس

٣ـ (ارهب) یانی ترساندنی[١٢]

٢) لە فیقهی ئیسلام دا

تیرۆریزم وەرگێڕانی بە ئیرهاب، وەرگێڕانی تەواو نییە، هەروەها وشەی ئیرهاب لە فیقهی ئیسلامی دا نەهاتووە بەڵام ناوەڕۆكو حوكمی هەیە لە ژێر وشەی رێگریو غەدر بكرێ راستترە، كەواتە روونكردنەوەی ناوەرۆكی وشەی تیرۆرو ئیرهاب دەبێ لەژێر رۆشنایی ناوەڕۆكو حوكمی رێگریو غەدر بكەین.[١٣]

ج) پێناسەی تیرۆری سیاسی

هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێدا پێناسەیەكی رەها (مطلق) نییە بۆ تیرۆرو جۆرەكانی تیرۆر، بەڵام لێرەدا بیرورای چەند نووسەرو خاوەن نەزەر سەبارەت بە تیرۆری سیاسی دەخەین بەر نەزەر.

نووسەری ئینگلیزی (ولوكروس) وا پێناسەی تیرۆ دەكا كە (توندو تیژییەكی هەرەمەكییە بەبێ گوێدانە بە بەدیهێنانی مەبەستێكو تەنیا ئاراستەی ئامانجێك ناكرێت).[١٤]

---

٣[١] د . محمد احمد گەزنەیی ، ئرهاب ، شوێنی چاپ هەولێر ، چاپخانەی زانین ، ساڵی ٢٠٠٤ ، ل ١٠

. [١]هەمان سەرچاوەی سەرەوە

٥[١] سەعد عبدالله ، گۆڤاری ئەمڕۆ ، ژمارە ٢٦ -- ٢٠٠ ، شوێنی چاپ هەولێر ، ساڵی ٢٠٠٤ ، ل ٣٩

بەڵام زانای ئەمریکی "ف. ولتر" تیرۆری سیاسی وا پێناسە دەکا کە پرۆسەیەکی تۆقێنەرەو لە سێ بنەما پێك هاتووە: کاری توندوتیژی یان هەرەشەکردنو بەکارهێنانی وردەکارییەکانی کاری خۆویستی کە ئەوپەڕی ڕێژەکانی ترسی قوربانیان یان قوربانییانی مەزندەکراو پێك دێت.[14] نووسەری ئەمریکی (و. هندرسن) وا پێناسە دەکا کە (کارێك یان هەڕەشەیەك بە توندوتیژی لەلایەن کەسێك یان زیاتر لە پێناو سازدانی ڕەوشێك لە ترسو دڵەڕاوکێو لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت کە تیرۆریستەکان دەیانەوێ ویستو بیرکردنەوەی ژێرانە لەناو بەرن، ئەوان دەیانەوێ هەموو کەسێك لە جانتایەك یان ئوتۆمبیلێکی ڕاگیراو بترسێن.[16]

لە ئینسکلۆپیدیای سیاسی هاتووە کە تیرۆر بەکار هێنانی توندوتیژی یە بە نایاسایی یان هەڕەشە کردنە بە شێوازی جیاجیادا.بە تیرۆر کردنی کەسایەتیەکان یان شێواندنیان یان تەقاندنەوەو بە مەبەستی هێنانەدی ئامانجێکی دیاری کراوی سیاسیو شکاندنی گیانی بەرەنگار بوونەوە لە دەستەو دامودەزگایەکان.[17]

بە گوێرەی ئەو پێناسانەی سەرەوە بەو ئاکامە دەگەین کە پێناسەی تیرۆر لە باری سیاسییەوە بەو کارو کردەوانە گوتراوە کە کەسێك یان تاقمێك لە ڕێگای زەبرو زەنگەو بە زۆری چەك زۆرجار کوشتنی خەلکیشی تێدا بووە ، ئەنجامیان داوە بە پێی ئوسوولی ئەخلاقیو ئینسانیو تەنانەت سیاسی ئەم کارە کارێکی مەحکومە چونکە کارێکی غەیرە قانوونیو غەیری ئاساییە کە ئەساسەکەی لە سەر زۆر داسەپاندنی ئەزمرێکی تایبەتی داندراوە کە گیانی ئەفرادو زۆرجار گیانی بێگوناە و بێ دیفاع دەخاتە مەترسییەوە.

---

[16] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

[17] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

[18] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

## تیرۆریزم و کۆماری ئیسلامی

تیرۆریزم له روانگەی کۆماری ئیسلامییەوه ستراتیژییه بۆ پاراستنی ئیزام‌و مانەوەی دەسەلاتی خۆی. ئەو دیاردەیە له نێو بیرمێشکی دامەزرێنەران‌و کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی‌دا بە تەواوی جێگای گرتووە، بۆتە رێبازو درێژەدانیشی بە ئەرکی سەرشانی خۆیان دەزانن. بۆ سەلماندنی ئەو راستییە لەباری قەزایی‌یەوە سەرنج دەدەینە قسەکانی "ئایەتوڵلا خومەینی"، دامەزرێنەری کۆماری ئیسلامیی ئێران لە رۆژەکانی ۱۷و ۱۹۷۹/۸/۲۰ کە ئاماژە بە قەدەغەکردنی رێکخراوە سیاسییەکان‌و بەستنی رۆژنامەکان دەکا.

"دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی‌و راگەیاندنی کۆماری ئیسلامی، هەندێك لە هێزە نێوخۆیی‌یەکان بە پشتیوانیی بێگانەکان‌و سەهیۆنیزم دژایەتییان لەگەڵ ئیسلام‌و کۆماری ئیسلامی نیشان داوە. تەنانەت هێندێك لەوان دژایەتیی ئێمەو هەڵبژاردنەکانیشیان کرد. [مەبەستی لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە]. هەمووتان دەزانن کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ئەمریکایی‌یەو سەهیۆنیزم پشتیوانیی لێ دەکا. حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانی بە حیزبێکی هەڵوەشاوە راگەیەندراوە، چونکە حیزبێکی شەیتانییە.

هەڵەی گەورەی ئێمە ئەوە بوو کە شۆڕشگێڕانە هەڵسوکەوتیان نەکرد، ئێمە بەو هێزە شەیتانییانە ئازادیان بەخشی. ئەگەر لە سەرەتاوە بەخێرایی کارمان کردبا، هەروەك لە پێوەندی لەگەڵ حکوومەتی تاغوتیمان کرد، ئەگەر لە سەرەتادا ئەو قەڵەمە پیسانەمان شکاندبان‌و ئەو رۆژنامە شەیتانیانەمان داخستبان‌و، ئەگەر لە کاتی خۆی‌دا رێبەری هەموو گرووپە شەیتانیەکانمان سزا دابا و، حیزبەکانیانمان هەڵوەشاوە راگەیاندبا و ئەوانمان لە مەیدانی شارەکاندا لە سێدارە دابان، وڵاتەکەمان لەو گەندەڵانە خاوێن دەبۆوەو ئێستا ئەو گرفتانەمان نەدەبوون. من داوای لێبوردن لە خواو خەڵکی خۆمان دەکەم بۆ ئەو

هەڵەیە. ئەگەر بە شێوەی شۆڕشگێڕانە ڕەفتارمان کردبا، ئێستا ئەو حیزبانەمان نەدەبوو. هەموو حیزبەکانمان قەدەغە دەکرد. هەموو هێزو ڕێکخراوەکانمان قەدەغە دەکردو تەنیا یەك حیزب، ئەویش حیزبوڵلامان دادەمەزراند کە حیزبی چەوساوەکانە. من بەڵێن دەدەم کە ئیتر ئەو هەڵەیە دووپات ناکرێتەوە. من هەموو ئەو هێزە شەیتانییانە ئاگادار دەکەمەوە کە ئەگەر کارو چالاکیی خۆیان تەواو نەکەن، ئێمە شۆڕشگێڕانە ڕەفتار دەکەین. [دەکوژین] ئێمە گوێ نادەینە ئەوە کە ڕۆژنامەکانی ڕۆژئاواو بلاوکراوەکانی سەر بە حکوومەتی پێشوو، چیمان لە دژ دەنووسن. ئێمە پێویستیمان بەوە نیە لە نێو ئێران، لە وڵاتانی ئیسلامیو جیهانیدا ڕێزمان لێ بگرنو ئێمان بکەن. ئەو پیلانگێڕانە بێ دینن. ئەو پیلانگێڕانەی لە کوردستانو شوێنەکانی دیکە کار دەکەن، سەر بە هێزە بێدینەکانن. دەبێ دژی ئەوانە هێز بەکار ببردرێ. دەوڵەت دەبێ بە توندی لەگەڵ ئەوانە ڕەفتار بکا. پۆلیس دەبێ هەموویان لە ناو ببا. ئەرتەش دەبێ ئەوانە لە ڕووی زەوی نەهێڵا. ئێمە بەتوندی لەگەڵ ئەوانە ڕەفتار دەکەین. ئێمە هەموو ئەوانەی کە دەیانەوێ لەگەڵ بێدینان وتوویژ بکەن، لە ناو دەبەین. شوورای نیگابان دەبێ هەموو ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی کە بێدینو دوژمنی خەڵکین، داخا. قازیی ئیسلامی دەبێ هەموو ئەو کەسانەی حیزب پێك دێنن، مەحکووم بکاو ڕێبەرانیان سزا بدا [ئیعدام بکا]. شكو گومان فڕێ بدەین، بڕۆن هێزە شەیتانییەکان لەناو بەرن.[1]

کە سەرنج دەدەینە ئەو دوو وتارە، بە تەواوی دەردەکەوێ کە هەموو حوکمو فتواو بڕیاری قەتعین بۆ سەرکوتو گرتنو کوشتنو ئیعدام بە هەر شێوەیەکی کە بۆیان دەرەخسێ، دەبێ نەیارو دژبەری خۆیان لەناو بەرن، بە بێ گوێدان بە هیچ عورفو یاسایەکی نێونەتەوەییو پرەنسیپێکی ئەخلاقی. بۆیە دەبینین بە دوای ئەمانی خومەینیدا سەردانی کۆماری ئیسلامی، خۆیان بە قوتابیی ئەو ڕێبەرە دەزانن و درێژەدانی ئەو فکرەش بە ئەرکی بنەڕەتیو بە بۆچوونی خۆیان بە ئەرکی شەرعیی دەزانن. بۆیە بینیمان

دروست لە چلەی خومەینی‌دا دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو، ڕێبەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ڤیەن لەسەر مێزی وتووێژ بە شێوەیەکی دوور لە هەموو عورف‌و یاسا ئەخلاقییەك، تیرۆریان کرد، هەر بەدوای ئەویش‌دا تیرۆری دیکەش ئەنجام دران کە دوایین تیرۆر لە دەرەوەی وڵات (لە ئالمان) بوو بەهۆی ڕیسوابوونی خۆیان لە مێژوودا. کەوابوو بنەماکانی کۆماری ئیسلامی لەسەر تیرۆرو تیرۆریزمی نێونەتەوەیی دامەزراوە. بۆیە مەترسییەکی گەورەیە کە هەڕەشە لە ئاشتیی جیهانی‌و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەکا.

سەرچاوە:

١ـ "کوردستان" ئورگانی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ژمارە ٣٩٧ ساڵی ٢٠٠٤

# بەشی دووهەم

# تیرۆریزمی نێودەوڵەتی

## پێناسەی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی

پێش ئەوەی پێناسەی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی بکەین وەك تاوانێکی نێودەوڵەتیو راڤەی لایەنەکانی پێویستە لە خودی مەفهومی تاوانی نێودەوڵەتی تێبگەینو تێبکۆشین پێکهاتەو رەگەزە سەرەکییەکانو حاڵەتە جیاکارییەکانی لەگەڵ جۆرەکانیتری تاوان دیاری بکەین.

مەفهومی تاوانی نێودەوڵەتی: چ لە رابردوو چ لە ئێستادا ئەو کۆبوونەوەو کۆنفراسو کۆنگرانە کەم نین کە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا بۆ پێناسەکردنی تیرۆرو تیرۆریزمی نێودەوڵەی بەستراون.

بەڵام هەتاکوو ئێستا نەتوانراوە لە سەر پێناسەیەکی تایبەتو رێك، کۆك بن. ئەوەش دەگەرێتەوە بۆ سەر رەوانگەی لایەنەکانی بەشدار چ لە بواری بۆچوونی سیاسییەوە یان لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییە ئابوورییەکاندا بێ. کە هەر کام لە رەوانگەی خۆیەوە پێناسە دەکا، بەڵام تیرۆریزمی نێودەوڵەتی وەك تاوانێکی نێو دەوڵەتی شیکردنەوەی لایەنەکانی

پێویستەبۆئەوەی لە خودی چەمکی تاوانی نێودەوڵەتی بگەین‌و هەوڵ بدەین پێکهاتەو رەگەزە سەرەکییەکان‌و شێوازو جۆرەکانی دیکەی تاوان دیاری بکەین. بەلام لێرەدا دەرەتانی ئەوەمان نیە بە وردی بچینە بنج‌و بناوانی هەموو ئەوانە، بۆیە تەنها ئاماژە بە چەمکی تاوانی نێودەوڵەتی دەکەین.لە گەڵ هۆکارەکانی بنبڕکردنی تیرۆر. کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە سەرەتای دروست بوونیەوە، کۆمەڵێك دیاردە لە خۆی هێنایە ئاراوە کە هێندێکیان لە رەوتی جووڵانەوەو گەشەسەندن دا یارمەتیدەرێکی باش بوون. هێندیکشیان شوێنی نالەبارو دزێویان هەبوو لە سەر رەوتی بەرەوپێشەوە چوون. دیاردەی تاوانیش یەکێکە لەو دیاردانەی جۆری دووەم. هەرچەند لە نێوان یاساناساندا سەبارەت بە چەمکی تاوانی نێودەوڵەتی لێلی و ئالۆزێك بەدی دەکرێ.

لەورۆوە "ڤ. پیلا" لە پێشەکی کتێبەکەیدا (کە لێکۆڵینەوەیەکی لە سەر پرۆژەی یاسای تاوانەکانی دژ بە ئاشتی‌و ئاسایشی مرۆڤایەتی‌و لەسەر داوای ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان پێ هەڵساوە) دەڵێت کە سەرچاوەیەکی ورد لەسەر ئەم بابەتە بوونی نیە، کێشەکەش بەهۆی نەبوونی وردبینییەك لە دیاریکردنی چەمکی تاوانی نێو دەوڵەتی‌و یاسای گشتی سەر هەڵدەدا.[18]

لە یاسای نێودەوڵەتیشدا بۆ ئەوەی هەر واقعەیەك بە تاوان لەقەڵەم بدرێ‌و سزای لە بەرامبەردابۆ دیاری بکرێ یاسای نێو دەوڵەتی‌و سروشتی تاوان وادەخوازێ کە پرۆسەیەکی ئیرادی بێ‌و لە یاسادا وەك کردەوەیەکی قەدەغەکراو و سەرپێچی کراو ئاماژەی پێکرابێ هەروەك چۆن پێویستە بکەرێکی دیاری هەبێ‌و سزای لەبەرامبەردا دیاری کرابێ.[19]

[18] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ٩٤

[19] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

بە گوێرەی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە ئەو رەگەزانەی کە تاوانی نێو دەوڵەتی پێ دەناسرێت و یاسای نێو دەوڵەتی سزایان پێ دەدا بریتین لە هەمان ئەو رەگەزانەی کە یاسای ناوخۆیی و نیشتمانی یەکان بە تاوان دایناون.

تاوانیش بەو شێوەیە کە لە یاسا ناوخۆیی یەکاندا هاتووە وا پێناسە کراوە: کە هەر لادانێك لە بازنەی رێسا یاسایی یەکان بە جۆرێك لە سنووری هەرێم یا خودی دەوڵەتە خاوەن یاساکە دەرناچێ، لە دوایشدا ئاسەوارەکانی ئەو سنوورە تێپەرێنێ و سزای بەرامبەریش هەر لە یاسای نێو خۆیی یەوە دیاری دەکرێ.[20]

بەڵام تاوانی نێو دەوڵەتی (هەر دەستدرێژی یەك کە بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی بە پێی یاسای گشتیی نێو دەوڵەتی بە جۆرێك سنووری هەرێم یاخود دەوڵەتەکان دەبەزێنێ و، بە هۆی ئاسەوارەکانیەوە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی دەخاتە بەر مەترسی یەکی گەورە.[21]

بە پێی ئەو دوو پێناسەیەی سەرەوە دەکرێ بگەینە ئەو ئاکامە کە هەردوو جۆری تاوانی نێو خۆیی و نێودەوڵەتی پرۆسەیەکن دژی بنەما یاسایی یەکان و لە ئەنجامدا ئاسەواری خراپیان بە دەوروبەر لێ دەکەوێتەوە بۆیە تیرۆر چ لە ئاستی نێو خۆیی و چ لە ئاستی نێودەوڵەتی دا ئەمرۆ بۆتە بەڵایەکی گەورە کە بەرۆکی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی گرتۆتەوە تیرۆریزم نە سنوور دەناسێ و نە تەمەن، نە جنسییەت و نە مەزهەب و میللەت، هەر ئەوەشە رۆژ بە رۆژ پەل و پۆ داوێ بۆیە پێویستە وەك ئەرك خاوەن ئەزمەر و پسپۆرانی ئەو بوارە تۆژینەوەی زیاتر و وردتر لەو بارەوە ئەنجام بدەن و هۆکارە سەرەکی یەکانی سەرهەڵدانی ئەو ئافاتە مەترسیدارە دیاری بکەن.

[20] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

[21] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

بەندی یەکەم:

## فاکتەرەکانی تیرۆریزمی نێو دەوڵەتی

سەبارەت بە چۆنیەتی دیاری کردنی هۆکارەکانی تیرۆر دوو ئاراستەی جیاواز هەیە.

یەکەم- بۆ شی کردنەوەی هۆکارەکان پێویستە جیاوازی لە نێوان سێ ئاست دا بکرێ:

١ ) ئاستی تاك (المستوی الفردی) ئەو پاڵنەرانەن وا لە تاك دەکەن کە پەنا بـۆ کـاری تیرۆریستی بەرن وەك ڕێگرییەکی بنەڕەتی لە ژیانیان دا.

٢ ) ئاستی نیشتمانی (المستوی الوطنی) ئەمیش ئەو پاڵنەرانەن کە کاری تیرۆریستی لە خودی دەوڵەتێك دا بە ئەنجام دەگەیەنن.

٣ ) ئاستی نێودەوڵەتی (المستوی الدولی) کە ئەویش کۆمەڵێك بارودۆخی نێودەوڵەتیە کە هانی تیرۆر دەدات دژی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی.

دووهەم - پێچەوانەی ئەو نووسەرانە هێندێك لە توێژەرەوەکان بۆ راڤـەکردنی تیرۆریـزم پەنا دەبەنە بەر سیفەتێکی گشتی بەبێگوێدان یان دیاریکردنی ئاراستەکان.[22]

ئەوەی کە لێرەدا بـە نیسـبەت ئێمــەوە گرینگــە تــەنها باســکردنە لــە فاکتــەرەکانی تیرۆریزمی نێو دەوڵەتی واتە لە ئاستی نێو دەوڵەتیدا. دوکتور محمد الفنام پێی وایە کە نابێ بڕیار لە هێندێك فاکتەر و هاندەر بدرێ بۆ تیرۆریزم لەبەر دوو هۆ.

١) لەبەر ئاڵۆزیو گرانیی بڕیاردان لەسەر ئەو فاکتەرانە.

٢) بڕیاردان لە سەر فاکتەرێکیش هیچ لە کاریگەری لـە سـەر کۆمــەڵگاناگۆڕێ، بـە گـۆڕانی فاکتەرەکـەش، بــەڵام لــە گــەڵ ئەمــەش دا دەبیــنین هــەوڵێکی زۆر دراوە بـۆ دیاریکردنی ئەو فاکتەرانە.[23]

---

[22] توفیق عمر محمد، سامان ئەحمەد مەحموود، زانا جەلال سەعید، گۆڤاری یاسا، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٠٦

[23] توفیق عومەر محەممەد، سامان ئەحمەد مەحموود، زانا جەلال سەعید، گۆڤاری یاسا، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٠٧

لیوا محەممەد غالب پێی وایە کە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە مەڕ هاندەرەکانی ئەو پرۆسەیە پێویستە باس لە بەشدارەکانی ئەو پرۆسەیە بکەین، بەشدارانیش ئەمانەن:

١) پاڵنەرەکانی پرۆسەی تیرۆر

٢) قوربانیانی پرۆسەکە

٣) ئاراستەکەرانی پرۆسەکە

٤) ئاراستەکەرە ناڕاستەوخۆ کان لە پرۆسەکەدا.[٢٤]

دکتور احمد محەممەد رفعت‌و دوکتور صالح بکر لە کتێبی (الارهاب الدولی) ئاماژەی بەو فاکتەرانە دەکەن:

١) فاکتەرە سیاسی‌یەکان

٢) فاکتەرە ئابووریەکان

٣) فاکتەرە ڕاگەیاندن و پڕۆپاگەندەکان

پێم وایە کە ئەم فاکتەرانە گرینگترن لەوانی دیکە و هەر ئەوانەشن کە دەبنە هۆی پاڵنەر و سەرهەڵدانی پرۆسەی تیرۆریزم بۆیە پێویستە کە شی‌یان بکەینەوە.

فاکتەرە سیاسی یەکان: یەکێك لەو فاکتەرە گرینگانە فاکتەری سیاسی یە لە ئەنجامی خراپ بوون و گەندەڵی سیاسی و ڕێژیمی سیاسی ئەو وڵاتە، یا چەوساندنەوەی نەتەوەی بندەست بە هۆی سیاسەتی ژینۆسایدو ئاپارتاید کە لە هێندێك وڵاتدا بەرجەستە دەکرێت ئەمەش وا دەکا ئاڵتێرناتیوی مەنتیق و زمان بگۆڕدرێت بە تیرۆر.[٢٥]

بەو هۆیەوە دەبینین کە یەکێك لە فاکتەرە رامیارییەکانی تیرۆریزم دنەدان یا خود پێکهێنانی هێزێکی ئاسیستمی یان پارتیزانی چەکداری یان بەکرێگراو بۆ ئانەوەی ئاژاوەو

---

[24] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، ژنا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٨-٧ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٠٨

[25] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، ژنا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٨-٧ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٠٨

ئالۆزی لە هەرێمی دەوڵەتێکی دیکە، بەشێوەیەك ئەو تاقمە چەکدارییانە بوونەتە داردەستێکی نوێ بۆ تیرۆریزم. جیا لەوەش پشتگیری هێندێك لە دەوڵەتان بۆ هێندێك تاقمو ڕێکخراوی سەرەکی تیرۆریستی فاکتەرێکی سەرەکی‌یە کە هەلومەرجەی ئێستای پێوەندی یە نێو دەوڵەتییەکان بەئاشکرا بەدی دەکرێت.[٢٦]

**فاکتەرە ئابووری یەکان:** ئەم هۆ کارانە خۆیان لە دادپەروەری و لاسەنگی سیستمی ئابووری نێو دەوڵەتیو ئیستیغلال کردن (هەڵقۆستنەوە)ی بیانی بۆ تواناو داهاتی گەلان دەبیننەوە، ئەمە جگە لە پێشێلکردنی بێشەرمانەی مافەکانی مرۆڤو مومارسەکردنی توندو تیژی لە هێندێك لە ڕێکخراوە سیاسی‌یەکان بۆ ڕووبەرو بوونەوەی پاکتاوی رەگەزی ئایینی دیاری کراوە. هێندێك جاریش هۆکاری پشت تیرۆریزمی نێودەوڵەتی بریتی‌یە لە زیان گەیاندن بە ئابووریی دەوڵەتێکی دیاریکراوو تێکشکانی دامەزراوە پیشەسازی‌و بازرگانی، هێرش بردنە سەر نووسینگەی کارگە گەشتو گوزارییەکان لە پێناوی ورووژاندنی ترس و دڵەڕاوکێو تۆقاندن لە ناو خەڵك دا.[٢٧]

**فاکتەری ڕاگەیاندنو پروپاگەندە:** دەزگاکانی پێوەندیو ڕاگەیاندنی نوێ کە خاوەن تێکنۆلۆژیایەکی باڵان ڕۆڵێکی گەورە دەبینن بب ئانەوەی تیرۆریزمو توندوتیژی.

هانی دەروونیی تاکەکان دەدرێ بۆ هەستان بە کاری قیزەونو تێکدەرانە لەواقیعدا بارودۆخی نێودەوڵەتی ڕاستی‌و گرێنگی فاکتەری ڕاگەیاندنی سەلماندوە.[٢٨]

---

[26] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری پاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٠٩

[27] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری پاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٠٩

[28] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری پاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١١٠

ابراهیم نافع لە کتێبی (کابوس الارهاب وسقوط الاقنعە) ئاماژەی بە چەند هۆکارێك دەکات لە مانەی خوارەوە پوختەیان دەکەین:

١) هەڵوێست وەرنەگرتن و نەرمی نواندنی زۆریەك لە دەوڵەت و حکومەتەکان بەرانبەر ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان

٢) زیادبوونی شانەو تۆڕی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی

٣ ) پێشکەوتنی تێکنۆلۆژی کە ڕێگەی بۆ هێندێك گرووپو لایەن خۆش کردوە بۆ وەدەست هێنانی چەکی وێرانکەر.

٤ ) بەشداری‌نەکردنی هێندێك دەوڵەت لە پرۆسەی بنبڕکردنی تیرۆریزم.[29]

هەرچەند لە گوتاری سیاسی خۆیدا خۆی بە یەکەم لایەنی تارانبار کردنی ئەو دیاردەو کردەوە دزێوە دەزانێو ئامادەیی خۆی بۆ بەشداریکردن لە هەموو پەیماننامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە سەرکوت کردنو بنبڕکردنی تیرۆریزم نیشان دەدا بەڵام دەبینرێ کە لە ڕێگای رایەڵکەو تاقمەکەوە بەردەوام هەوڵی پشتگیری کردنی دیاردەکە دەدات. هەر ئەوەشە کە ئەمڕۆ نیزیکەی (٣٨٠) ڕێکخراوی تیرۆریستی لە (٦٠) دەوڵەت دا بوونیان هەیە.

دوکتور حسێن تۆفیق مامۆستای زانستی سیاسەت لە زانکۆی قاهیرە لەمەڕ ئەو دیاردەیە ئەو فاکتەرانەی خوارەوە دەخاتە روو:

١) نەبوونی بەرنامەیەکی ئاراستەکراوی نەتەوەیی.

٢) گەشە کردنی هزری کۆدەتا لە ئەنجامی تێکچوونی بارودۆخی سیاسی.

٣) وەستان لە قۆناخی دیاریکراوداو کارنەکردن بۆ گەیشتن بە دیموکراتییەت.[٣٠]

---

[29] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

[30] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١١١

سەبارەت بەو هۆکارانەی دەڵێین فاکتەرێکی سەرەکی لە تەشەنەکردنی دیاردەی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی کە هەڕەشەو مەترسی یەکی گەورە لەسەر ئاشتی‌و ئاسایشی نێو دەوڵەتی خولقاندووە دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی سیستمی سیاسی نێو دەوڵەتی بۆ سزادانی هەموو ئەو لایەن‌و دەوڵەتانەی کە فەرقی پەیمان‌و رێککەوتن نامە نێودەوڵەتییەکان ناکەن کە بە سەرچاوەیەکی سەرەکی یاسای نێودەوڵەتی جیهان دادەنرێ.

## بەندی دووهەم:

## شێوازەکانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ کە چەندین شێواز هەیە کە تاقمە تیرۆریستەکان پەنای بۆ دەبەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان، هەروەها پەرەپێدانی ئەو شێوازانەش بە گۆڕانی کات‌و شوێن‌و ئامانج‌و رێکخستنەکان لە رووی دارشتنی پلان‌و وردبینی‌و قەبارەوە جیاوازییان هەیە بە شێوەیەکی گشتی هەموو لایەنەکان لەسەر ئەم حاڵەتانە کۆکن:

١) رفاندنی فرۆکە

٢) تیرۆری جەمعی (بە کۆمەڵ)

٣) تیرۆری فەردی (تاکەکەسی)

لێرەدا ئامەهوێ ئەم سێ حاڵەتە بە وردی شی بکەمەوە تەنها بە ناوبردنی شێوازەکان قەناعەت دەکەین‌و لەسەر هەر کامیان بە شێوەیەکی کورت دەدوێین‌و چەند نموونەیەك دەخەینە روو. تەنها ئەوە دەڵێین کە لە ناوەرۆکی ئەم سێ‌حاڵەتەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە شێوازەکانی پیادەکردنی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی بە تەواوی دژی هەموو پرەنسیپەکانی یاسای گشتی نێودەوڵەتی یە، ناشکرێ بڕیار لەسەر دیاریکردن‌و فۆرمۆلەکردنی ئەو شێوازانە بدرێ بە هۆی کاریگەری ئەو پێشکەوتنە تەکنۆلۆژییەی کە هەموو بوارەکانی

ژیانی گرتۆتەوە. ئەم پرۆسەیە بە شێوەیەك سوودی لێ وەردەگیرێ کە نێگەتیڤانە بە سەر کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا دەشکێتەوە.[31]

١ـ ڕفاندنی فڕۆکە: سەبارەت بە ڕفاندنی فڕۆکە لە فەرهەنگی سیاسی د. عبدالوهاب الکیالی دا هاتووە کە (بریتی یە لە دەست بەسەرداگرتنی فڕۆکە لە کاتی فڕینی [پەرواز] بە ئاسمان دا لە ڕێگەی پەنا بردن بۆ هەڕەشە کردنێکی ئاشکرا بە بەکارهێنانی توندوتیژیو ناچار کردنی ستافەکەی بۆ گۆڕینی ئاراستەکەی (جهت) بەرەو فڕۆکەخانەیەکی بێلایەن یاخود هاوکاری ڕفێنەرەکانن بە مەبەستی گرێبەستێك بۆ بەدەست هێنانی تەنازولات بەرامبەر بەردانی ڕفێنراوەکانو فڕۆکەکە).[32]

ئەم کردەوەیە ئەگەرچی هێندێك لە زانایانو یاساناسان لە هەندێ حاڵەتی دیاری کراودا بە تایبەتی لە کاتی بەرگری شەڕی چەکداری دژی دوژمنان پەنا بردنە بەری بە ڕەوا دەبینن. بەڵام لەلایەکی دیکەوە زۆربەی ئەو ڕێککەوتنامانەو پەیماننامە نێو دەوڵەتی یانەی کە یاسای گشتی نێو دەوڵەتی پێك دەهێنن بە ڕەهایی (مطلق) ڕەتی دەکەنەوە.

بۆ نموونە ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٤٦ی ژنێڤ کە ماددەی (٣)دا ئەم پرۆسەیە ڕەت دەکاتەوە. هەروەها ماددەی ١/١١ لە ڕێکەوتننامەی تۆکیۆ ساڵی ١٩٦٣ ئەو پرۆسانە دیاری دەکات کە دەچنە خانەی تاوانی ڕفاندنی فڕۆکە کە ئەوانیش:

ا/ هەڕەشەکردنو بەکارهێنانی توندوتیژی لە ڕێگایەکی نارەوایانە لە نێو فڕۆکەولەکاتی فڕینیدا.

ب/ مەبەست لەو کارە چ ئەگەرە خستن بێ بۆ بەردەم فڕینی گەشتی فڕۆکە یاخود دەست بەسەرداگرتنو چاودێری بێ بەسەری دا.

[31] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی ڕەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١١٥

[32] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی ڕەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١١٢

ج/ پلان گێڕان‌و بەرنامە ڕێژی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە [٣٣]

ئەگەر سەیری بارودۆخی سیاسەتی نێو دەوڵەتی لە سەردەمی نوێدا بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە بە هۆی ئەو پێشکەوتنە تەکنۆلۆژیەی لە بواری پەیوەندیکردن‌و زیاتر بەکار هێنانی گواستنەوەی هێڵی ئاسمانی‌و زیاد کردن‌و قوڵ بوونەوەی کێشە سیاسیەکان لە ئاستی نێو دەوڵەتیدا پەنابردن بۆ ئەم پرۆسە ترسناکە لە برەودا بووە. جیا لەوانەش دەبینین کە شێوازی گرتنی کەسایەتی‌و بە بارمتە گرتنیان دیاردەیەکی بەر بڵاوی ئەمڕۆی گۆڕەپانی نێو دەوڵەتی یە کە زۆربەی تیرۆریستەکان پەنای بۆ دەبەن لە پێناو بەکارهێنانی وەك فشارێك بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیەکانیان. لێرەدا چەند نموونەیەك دەخەینەڕو بۆ سەلماندنی ڕاستی مەسەلەکە.

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٧دا حکوومەتی ژاپۆن ناچار بوو داواکاریی ئەو ترۆریستانە قەبووڵ بکا کە سەر بە ڕێکخراوی سیکیجین (sekigun)ی ژاپۆنی بوون کە فرۆکەیەکی کۆمپانیای هێڵی ئاسمانی ژاپۆنیان بە سەرجەم سەرنشینەکانەوە ڕفاندبوو، لە میانەی گەشتێکدا لە تۆکیۆوە بۆ پاریس، ڕفێنەرەکان داوای بڕی شەش ملیۆن دۆلارو ئازاد کردنی (٩) ئەندامی ڕێکخراوەکەیان دەکرد کە لە بەندیخانەکانی ژاپۆندا زیندانی کرا بوون، هەرەشەی کوشتنی سەرنشینەکان‌و ڕەوتی (ستافی) فرۆکەیان دەکرد. ئەگەر داواکەیان جی بە جێ نەکرێ. پاش جێبەجێکردنی داواکەیان فرۆکەکە لە جەزائیر نیشتەوەو سەر نشینەکانی خۆیان دا بەدەست دەسەڵاتدارانی جەزائیرەوە "فۆکۆدای" سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتی ژاپۆن ڕایگەیاند کە سەرجەم هەوڵ‌و کۆششەکانی دەخاتە گەڕ،

---

[33] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی ڕەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١١٣

لە پێناوی پێشخستنی هاوکاریی نێو دەوڵەتی، لە بواری قەدەغەکردنی تیرۆرو رفاندنی فڕۆکەکەدا.[٣٤]

لە ٥ی نیسانی ساڵی ١٩٨٨ کەسێکی چەکدار دەمانچەی لەسەرسەری فڕۆکەوانی کۆمپانیای هێڵی ئاسمانیی کوێت کە لە بانکۆکەوە بەرەو کوێت دەرۆیشت راگرت، داوای لە فڕۆکەوانەکە کرد بەرەو فڕۆکەخانەی مەشهەد لە ئێران بڕوات‌و لە هەمان کاتدا ژمارەیەکی دیکەی هاوکاری ئەو کەسە، لە نێو فڕۆکەکەدا کە دەمانچەو بۆمبی دەستییان پێ بوو هەستان بە کۆکردنەوەو بەستنەوەی سەرنشینەکان. رفێنەرەکان داوای بەردانی ١٧ زیندانیان دەکرد کە لە کوێت زیندانی کرا بوون‌و هەڕەشەی کوشتنی بارمتە گیراوەکانیان کرد، ئەگەر داواکەیان جێبەجێ نەکرێ. پاش ئەوەی فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی مەشهەد سووتەمەنی وەرگرت لە سەر داوای رفێنەرەکان فڕۆکەکە لە گەشتەکەیدا بەرەو بەیروت چوو. بەڵام دەسەڵاتدارانی لوبنان رێگەیان پێنەدا لە خاکەکەیاندا بنیشێتەوە بۆیە ناچار بوو لە گەشتەکەیدا بەردەوام بێ، تاکو لە فڕۆکەخانەی "لارناکای قوبرس" نیشتەوە.[٣٥]

بە پێی رێکەوتننامەی بنبڕکردنی تاوانەکانی دەستدرێژی بۆ سەر ئاسایشی فڕۆکەوانیی مەدەنی. کە لە شاری مۆنتریال لە رۆژی ٢٣ی ئەیلوولی ١٩٧١دا مۆر کرا بە گوێرەی ماددەی (١) بۆ رێگە گرتن لەم تاوانانە، پێویست دەکا. رێوشوێنی گونجاو بۆ سزادانی تاوانباران ئەنجام بدرێ، کە هەر کەسێ بە ئەنقەست و بێ مافێکی رەوا کارێ لەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدا بەتاوانبار دادەنرێ.

---

[34] د.احمد محمد رفعت، د. صالح بکر ئەلتەیبار، وەرگێڕانی کوێستان جمال، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢ ل ١٥ و ١٦

[35] د.احمد محمد رفعت، د. صالح بکر ئەلتەیبار، وەرگێڕانی کوێستان جمال، تیرۆری نێودەوڵەتی، سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢ ل ١٩

ئەلف/ دەست بداتە کاری توندو تیژی دژی کەسێك لە ناو فرۆکە لەکاتی فرینیدا ئەگەر هاتو ئەو کارە بووە هۆی ئەوەی ئاسایشی فرۆکەوانەکە بکەوێتە مەترسیەوە.

ب/ فرۆکەیەك لەکار بخاتو ئەتوانێ بفرێ یان رەنگ بێ ئاسایشی فرۆکەکـە لـە کـاتی فریندا رووبەرووی مەترسی بکاتەوە.

ج/ بەهەر شێوازێك ئامێر یان ماددەیەك بخاتە نـاو فرۆکەکـەوە کـە شـێمانەی لـەکار خستنی فرۆکەکەی لێبکەوێتەوە یان کەمو کوری تێدا پەیدا بکا کـە رەنـگ بـێ لـەکاتی فرینی ئاسایی دا رووبەرووی مەترسی بکاتەوە.

د/ ئاسانکاریی هاتووچۆی ئاسمانی تێکبدا یان دەست بۆکارێك بەرێ کەئەگەر هاتوو بە هۆی ئەو کارانەی شیمانەی ئەوە کرا ئاسایشـی فرۆکەکـە لـە کـاتی فریندا رووبـەرووی مەترسی بکاتەوە.

هـ/ ئەگەر زانیاریی درۆی راگەیاندو بەوەش ئاسایشی فرۆکەکانی لە کاتی فریندا بخاتـە مەترسیەوە.)[36]

٢) تیرۆری جەمعی:

(ئەنجومەنی ئاسایش لە ٩ی ئەیلوولی سالی ١٩٧٠دا بریارێکی دەرکـردو نیگـەرانیو بێزاریی زۆری دەربری سەبارەت بەو هەرەشانەی کـە رووبـەرووی ژیـانی هاوولاتیـانی بـێ تاوان دەبێتـەوە)[37] وەك تەقاندنەوەی فرۆکە، بنکە ئابوورییەکان، شوێنە گشتی یەکان... !

مەبەست لێرەدا نواندنی هێزو توانایە بۆ چاوترسێن کردنو ئانەوەی ترسو دڵەخورپەیـەکی زۆر لە نێو خەڵك دا. چونکە ئەوجۆرە تیرۆرە جیاوازی ناکا لە نێوان هیچ چـینو توێـژێکی کۆمەڵدا، لە ئەزەر بگەر یان دەستووردەرانی کردەوەکە جیاوازیەك لە نێوان ئەو کەسانەی

---

[36] د.احمد محمد رفعت ، د. صالح بكر ئەلتەبیار، وەرگێرانی کوێستان جمال ، تیرۆری نێودەوڵەتی ، سلێمانی ،چاپخانەی رەنج ، سالی ٢٠٠٢ ل ٢٠٩ و ٢١٠

[37] د.احمد محمد رفعت، د. صالح بكر ئەلتەبیار، وەرگێرانی کوێستان جمال، تیرۆری نێودەوڵەتی، سلێمانی ، چاپخانەی رەنج، سالی ٢٠٠٢ ل ١٨٠

کە بە بڕوای وان تاوانبارن لەگەڵ پیرو منداڵو ئافرەتی بێ تاوان نابینەدرێ. نموونەی بەرچاوی ئەم جۆرە تیرۆرە یەکەم ڕووداوی ١١ی سێپتامبری ساڵی ٢٠٠١ کە بوو بە هۆی تەقاندنەوەی بورجەکانی ناوەندی بازرگانیو ئابووری ئەمریکا لە نیویۆرك کە دەیان میلیارد دۆلار خەساراتی ماڵی و هەزارن کەس گیانیان لە دەست دا.[38]

دووهەم: ڕوداوی دڵتەزێنی ١ی شوباتی ساڵی ٢٠٠٤ کە لە دووکردەوەی خۆکوژیی هاوکات دا لە شاری هەولێر ئەنجام دران، یەك لە بنکەی لقی ٢ی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقو ئەوی دیکە لە بنکەی مەڵبەندی ٣ی یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان کە جیا لە بریندارەکان، ٩٨ کەس گیانیان لەدەست دا،[39] هەروەها چەندین نموونەی دیکەی لەو شێوە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا لە عێراق ڕوویان داوە کە بەراستی ئەمڕۆ تیرۆری جەمعی لە ئاستی جیهاندا بۆتە مەترسییەکی گەورە کە هەڕەشە لە ئاشتیو ئاسایشی نێودەوڵەتی دەکا. (ئەوەی تێبینی دەکرێ لەم ماددانەی ڕێکەوتنامەی ژنێف بۆ قەدەغەکردنو بنبڕکردنی تیرۆریزم ئەوەیە کە ئەو حاڵەتانەی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی ئاماژەیان پێ دەکرێ بە شێوازێکی بەرین دارێژراون، بە جۆرێك کە زۆر لە حاڵەتەکان دەبینین کە بە هەڕەشەیەکی ترسناكو پرۆسەیەکی تیرۆریستیی گەورە دادەنرێ بۆ سەر ئاشتیو ئاسایشی نێودەوڵەتی)[40]. ئەم ڕێکەتننامەیە تەنها جەخت لەسەر ئەو پرۆسە تاوانکارییانە دەکاتەوە کە دژی دەوڵەتو دەزگا سیاسییەکانی ئەنجام دەدرێ کە ئەوەش بێگومان کەلێنێکی گەورەو ناتەواوییەکی دیار لە سەر تەواو کاری پرۆسەکە بەجێ دێڵێ.

---

٣٩ محمد حسنین هیکل ، ئالۆزیك لە ئەمریکا و لە جیهاندا ، کتێبی دوای هەژانی دنیا ، وەرگێڕانی ڕێبوار کەریم وەلی ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ٨ - ٧

٤٠ ئەریمان طالیبەوزیاسی ، نرخی ئازادی ، چاپخانەی منارە ، هەولێر ، ساڵی ٢٠٠٥

٤١ تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٨-٧ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ل١٣٨

چونکە دەبینین کە لەو سەردەمەدا خودی ڕێکەوتننامەکە ئێستاشی لەگەڵدا بێ پرۆسەی تیرۆریستی ئاراستەی زۆرێك لە ڕێکخراوەکانو دژی خەڵکانی مەدەنی ئەنجام دەدرێن، چونکە ئاکامو ئامانجی تیرۆریزم تەنها خوڵقاندنی حاڵەتێکە لە ترسو دڵەڕاوکێ بە شێوەیەکی توندوتیژ کە دەبێتە هۆی کوشتنو لەناوبردنی سەدان کەسی بێ تاوانو وێرانکردنو ڕووخاندنی دامودەزگاکانو دەستبەسەرداگرتنی هەموو ئەوانەی پێویستییان بە وریاکردنەوەی ویژدانی مرۆڤایەتیو گرنگی پێدانی جیهانەو پێویستە دەسبەجێ بە شێوەی جیدی کار بکرێ لە پێناو گەیشتن بەو ئامرازو ڕێگەچارانەی کە دەتوانرێ لە ڕێگەیانەوە کۆتایی بەو تاوانە مەترسیدارە بهێنرێ، کە قاڵبێکی نێودەوڵەتی بەخۆوە گرتووە.

تیرۆریزمی فەردی: لە زانستی تاوان سێ تێڕوانینی جیاواز هەیە لە بارەی توندوتیژیی سیاسی. ا/ توندوتیژیی دژی دەوڵەت بە مەبەستی تێکدانی ئاسایشی نێوخۆی وڵات وەك ئەو توندوتیژییە وایە کە ئاراستەی ئاسایشی دەرەکی یان جۆری ئەتەومییەکەی دەکرێ، لە ڕووی مەترسییەوە وەك تاوانی دەستدرێژیی نێودەوڵەتییە. لایەنگرانی ئەم بۆچوونە پێیان وایە پێویستە لەسەر دەوڵەت ڕووبەڕوی تاوانی سیاسی ببنەوە، بە هەمان ئەو هێزەی کە ڕووبەڕوی دوژمنێکی بیانی دەبێتەوە. تەنانەت ئەگەر ببووە هۆی بەزاندنی چوارچێوەی دەستورو پەنابردنە بەر یاسا نائاساییەکانیش. ئەم ڕوانگەیە تا سەدەی نۆزدەهەم برەوی هەبوو، چەند ئەنجامێکی لێکەوتەوە کە گرینگترینیان لە سێدارەدانی تاوانباری سیاسی یان ئەنجامدەری کاری تیرۆریستی بووە، بەوەی کە دوژمنی کۆمەڵگان لەو سۆنگەیەوە کە دەستدرێژیی کردنە سەری، لە ڕاستیدا دەستدرێژی کردنە بۆ سەر خودی کۆمەڵگا.[41]

[41] ـ احمد محمد رفعت، د. صالح بكر ئەلتەیبار ، وەرگێڕانی کوێستان جمال ، تیرۆری نێودەوڵەتی ، سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ل٩

ب/ تیئۆریی دووەم کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا وەك کاردانەوەیەك بۆ تیئۆریی تاکەکەسی دەرکەوت کە داوای رزگاربوونی دەکرد لە چوارچێوەی یاسا یان سیاسەتدا. لایەنگرانی ئەم بۆچوونە پێیان وایە پێویستە وا سەیری دەوڵەت نەکرێ کە دەسەڵاتێکی رەهایە، بەڵکوو بەوە کە دەسەڵاتێکە ئەرکی پاراستنی مافی تاکەکانی لە ئەستۆیە تیئۆریەکە سەرنجی بۆ لایەنە نێگەتیڤەکانی دەستێوەردانی حکوومەت لە کاروباری تاکدا راکێشاوە، تەنها لە کاتێکدا نەبێ بە پابەندبوون بە دەقە یاساییەکان لە ئەنجامەکانی ئەم تیئۆریە ئەوەیە کە دەبێ دەسەڵات لە گەلەوە بێ نەك لە دەستی فەرمانڕەوادا بێ. چونکە فەرمانڕەوابوونی خۆی لە ویستی گەلەوە وەردەگرێ.

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە گۆڕانکاریی بنەڕەتی لە بۆچوونی زانستی تاوان لەمەڕ تاوانی سیاسی پەیدا دەبێ‌و ئەم جۆرە تاوانە دابنرێ بە دەستدرێژی بۆ سەر کەسی دەسەڵاتدار نەك بۆ سەر کۆمەڵگا، دواتر وەکو سەرجەم تاوانەکانی دیکە بە تاوانی سیاسی دادەنرا.[42]

ج/ بە مەبەستی نزیك کردنەوەی ئەو دوو ئەزمەریەی پێشوو، بۆچوونێکی نوێ دەرکەوت کە دەبێ هەڵوێستی ئەو هاندەرانە بۆ ئەنجامدانی تاوانەکەی لەبەرچاو بگیرێ، کە رەنگە هاندەرەکەی تایبەتی بێ کە بانگەشەی بۆ دەکا. لە سیستمی دەسەڵاتدا نابینێ، لەبەر ئەوە ئەم بۆچوونە دەستی کرد بە هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەو سووککردنی ئەو سزایانەی بەسەر ئەنجامدەرانی تاوانە سیاسییەکاندا دەسەپێنرێ‌و بە شێوەیەکی تایبەت مامەڵەیان لە تەکدا بکا، بەوەی کە سزادان هەرچۆنێك بێ تاوانباری سیاسی لەکەدار ناکا. لە سۆنگەی ئەو پاڵنەرە نیشتمانی‌و جوامێرانەی کە هەیەتی رەنگە لە تاوانبارێکەوە بیگۆڕێ بۆ پاڵەوانێکی میللی‌و سەرنجی جەماوەر رابکێشێ‌و پشتگیریی رای گشتی بەدەست

---

[42]ـ احمد محمد رفعت، د. صالح بکر ئەلتەییار، وەرگێڕانی کوێستان جمال، تیرۆری نێودەوڵەتی، سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ۲۰۰۲ ل۱۰

بهێنن.[٤٣] لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەدا بەرردی دێنە سەر ئەو بابەتەو لێی دەدوێن‌و بە بەڵگەی‌و سەلمێنراو نموونەکە دەخەینە روو کە بابەتی ئەسڵیی کتێبەکەمانە.

## بەندی سێهەم: تایبەتمەندی یەکانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی

پەیوەندی ئەم دوو چەمکە لەوەدا بەدی دەکرێت کە تیرۆریزم ناکرێ بەبێ کاری توندوتیژی سەر هەڵبدات، واتە توندوتیژی ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە ئامانجێک، بەڵام ناکرێت توندوتیژی رەوایی لە ئەدەبیاتی سیاسیدا بە تیرۆریزم لە قەڵەم بدرێ، ئەمەش بەو مانایە دێت کە هەموو پرۆسەیەکی تیرۆریزمی بریتی یە لە ئەنجامدانی کاری توندوتیژی بەڵام مەرج نییە هەموو پرۆسەیەکی توندوتیژی سیاسی بەکاری تیرۆریستی لە قەڵەم بدرێ.[٤٤]

بەپێی ئەم ناوەرۆکە بەو قەناعەتە دەگەین کە جیاوازی یەکی تەواو لە نێوان ئەو دوو چەمکەی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی‌و توندوتیژی سیاسی دا هەیە. بۆیە لێرەدا بە پێویستی دەزانین کە پێشەکی لێکدانەوەیەکی تایبەت بۆ چەمکی توندوتیژی سیاسی بکەین پاشان لەگەڵ تیرۆریزمە نێودەوڵەتی یەکان بەراوەردی بکەین.

أ) توندوتیژی سیاسی

١) تیرۆریزمی نێودەوڵەتی و توندوتیژی سیاسی: لەرووی زمانەوانی یەوە چەمکی توندوتیژی لە بازنەی هەموو ئەو هەڵس‌وکەوتانەی کە توندی‌و رەقی زەبروزەنگ لەخۆ دەگرێت‌و دەخولێتەوە، لەرووی ماناشەوە (Violence)ی بەمانای توندوتیژی دێ کە لە

---

[٤٣] احمد محمد رفعت ، د . صالح بکر ئەلتەییار ، وەرگێرانی کوێستان جمال ، تیرۆری نێودەوڵەتی ، سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ل١١

[٤٤] توفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری پاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٣٦

نەسلی وشەی (Violentia)ی لاتینییەوە تاشراوە کە بەمانای بەکارهێنانێکی نارەوای هێزی ماددی دێت.[44]

دووهەم) لەرووی تیۆرییەوە "نظری": توندوتیژی هەموو ئەو پرۆسانەیە کە هێزو توندیو زەبروزەنگی تێدا بەکار دێت بە شێوەیەکی گشتی واتە مەعنەوییو ماددیو شێوازێکی تاکی کۆمەڵیش لەخۆ دەگرێ.[46]

لێرەدا گرینگە جیاوازی لە نێوان دووجۆر لە توندوتیژی بکرێت، توندوتیژی ماددی، توندوتیژی سەمبولیك (الرمزی). توندوتیژی ماددی زەرەرێکی بابەتیانە دەگەیەنێتە بەرامبەر، وەك لێدانی بەرژەوەندی، بەڵام توندوتیژی سیەمبولی کارگەری یەکی سایکۆلۆژیانەی لێدەکەوێتەوە.

لەو تێکهەڵکێشانەوە ئەو راستی یە روون دەبێتەوە کە دەمەوێ توندوتیژی لەدوو ئاستی جیاواز لە یەکتر ئەنجام بدرێ کە گومانی تێدا نییە ئەوەشی بە پێی سروشتەو تایبەتمەندی یەکانی ئەو ئامانجانەی کە خوازراوە بهێنرێتە دی دەگۆرێ، وێدەچێ لە زۆر کاتدا بەکار هێنانی توندوتیژی سایکۆلۆجی قۆناغێك بێ بەرەو مومارسەکردنی توندوتیژی ماددی، لەئاکام دا هەردوو جۆرەکە ئامانجی گەیشتنە بە داواکارییەکان لە رێگای بەکارهێنانی هێزەوە.

"دوکتور عبدالرضا الطعان" لە کتێبی (مفهوم الثورە)دا لە ئاماژەکردنێکدا بۆ پرۆسەی توندوتیژی بۆچوونی "کارل فون کلۆز فیتز" دەخاتە روو کە پێی وایە توندوتیژی روویەکە لە رووەکانی شەر، ئامانجی ملکەچ پێکردنی دوژمنە بۆ ئیرادەی بکەر.[47]

---

[45] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری پاسا ، ژمارە ٨-٧، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ١١٧

[46] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری پاسا، ژمارە ٨-٧ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ل ١١٨

[47] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

"تیت هنور"یش له کتێبهکهیدا به نێوی (العنف السیاسی) پێی وایه که توندوتیژی بریتی یه له پهنابردنێکی گهوره یا تێکشکێنهرانهی هێز دژی تاکهکان که لهرووی یاساوه بهکارهێنانی قهدهغه کراوه به ئامانجی گۆڕانکاری له بوونی تاکهکان لـه کۆمهڵگهیهکـدا ئاراسته بکرێت.[٤٨]

گومانیشی تێدا نیه که دهرکهوتـهکانی توندوتیـژی سیاسـی لهسـهر هـهردوو ئاسـتی ناوخۆو نێودهوڵهتی جیاوازیان ههیـه چ لـه رووی ئـامرازهوه چ لـه رووی سروشـتو ئـهو ئامانجه بالآیانهی له پشت سهرههڵدانیهوهن. له ئاستی ناوخۆدا له شـێوهی خۆپیشـاندانو کودهتاو شۆڕشو شهڕی ناوخۆییدا دهردهکهوێت و له ئاسـتی نێودهوڵـهتی دا هـهر چـهند کارێکی مهحاڵه دهرکهوتهکانی له قاو بدرێن بهڵام دهکرێ ئاماژه به دیارترینیـان بکرێـت که بهدرێژایی مێژوو له پهیوهنـدی یـه نێودهوڵـهتی یـهکان روویـان داوه کاریگهرییـهکی راستهوخۆیان له خولقاندنی گۆڕانکاری ههبووه، ئهوانیش جهنگ بهههموو جۆرهکانیـهوهو کۆنترۆڵی دهوڵهته داراکان به سهر چارهنووسی دهوڵهته نهدارهکانهوه.[٤٩]

---

تیرۆریزم لهبهر ئهو تایبـهتمهندییه کۆمهڵایهتییهی که ههیهتی زۆر ئاڵۆزو تێکـهڵاوه بـه جۆرێك نارِوونه که ناتوانرێ هیچ لایهنێکی له شێوهی قالبێکی دیاریکراودا رهها (مطلق) بکرێتهوه.

دیاره فاکتهری ئهو ئاڵۆزیو نادیار بوونه به پلـهی یهکـهم دهگهڕێتـهوه بـۆ تێکـهڵاوی لهگـهڵ دیـارده کۆمهڵایهتییـهکانی دیکـهی وهك چـالاکی جوولانـهوه شۆڕشـگێرانهو

---

[48] تۆفیق عمر محمد، سامان احمد محمود، زانا جلال سعید، گۆڤاری پاسا، ژماره ٧-٨، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانهی رهنج، سالی ٢٠٠٢، ل ١١٩

[49] تۆفیق عمر محمد، سامان احمد محمود، زانا جلال سعید، گۆڤاری پاسا، ژماره ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانهی رهنج، سالی ٢٠٠٢، ل ١٢١

رزگاریخوازەکانی توندوتیژی سیاسیو شەڕی پارتیزانیو شەڕی رێکخراوەیی کە لە ئاکامدا ئەرکی دیاری کردنی خەسڵەتو تایبەتمەندییەکانی تیرۆریزمی نێو دەوڵەتی گرانتر کردوە.

بۆ ئەوەی ئەو تایبەتمەندیانەی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی بخەینە روو دەبێ لێکدانەوەیەکی تایبەتی بۆ هەر یەك لەو مەفهومانەی کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێکردن ئەنجام بدەینو خاڵە جیاوازی یەکانیان دەست نیشان بکەین. کەواتە بابەتەکە لەو دووبەشەی خوارەوەدا دەخەینە روو:

بەشی یەکەم/ تیرۆریزمی نێودەوڵەتیو توندوتیژی سیاسی

بەشی دووهەم/ تیرۆریزمی نێودەوڵەتیو چالاکی بزووتنەوە رزگاریخوازەکان.

بەشی یەکەم: لێکۆڵەرەوەکان زەحمەتو ماندووبوونێکی زۆریان بینیوە بۆ لێکدانەوەی هەریەك لە چەمکی تیرۆریزمی نێودەوڵەتیو توندوتیژی سیاسی لە پێناو گەیشتن بە ئاکامێك کە هەر یەك لەو دوو چەمکە وەك خۆی بناسرێ. بەو پێیەش کە هەر دوو چەمکە کە ئاڵۆزو تێکەڵاو بوونە هێندێك لە لێکۆڵەرەوەکان لە سەرروبەندی ئایدیۆلۆژییەتێکی تەسکەوە هەردوو چەمکەکە لەیەك ساتدا دەبیننەوەو هەموو خاڵە جیاوازەکانی نێوانیان رەت دەکەنەوە بەو بناغەیەی کە هەردووکیان لەئاکامدا یەك ئامانجو مەبەستیان هەیە.

بەڵام لەراستیدا دەکرێ جیاوازییەکی زانستیانە لەنێوان هەردوو مەفهومەکەدا بەدی بکرێت. هەر لە ناساندنیو بنەرەتو خەسڵەتەکانیەوە هەتا دەگاتە دەرەنجامو کاریگەری ئاسەوارەکانی هەر یەکەیان. بەڵام لێرەدا خۆمان لە شیکردنەوەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی دەبوێرین، بەڵام پێویستە مەبەستو ئامانجەکانی توندوتیژی سیاسی شی بکەینەوە کە لە بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازیی نیشتمانیدا بەرێوە دەچێ. جیاوازی دابنێین لە نێوان تیرۆری نێودەوڵەتیو توندوتیژی سیاسیدا. لێرەدا رەوا بوونی رەوشتو سیاسەتی خەباتی ئەو گەلانەمان بۆ روون دەبێتەوە کە لەدژی رژێمە داگیرکەر یان رەگەزپەرستو ماف

پێشێلکەرەکان یان بە هەر شێوەیەك مافو ئازادی یەکانی مرۆڤ بەربەست دەکەن. بە هەموو ئەو کەرستانەی کە لەبەر دەستدایە بە هێزی چەکداریشەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە جەخت لەسەر تێکەیشتنی خەباتی رەوای چەکداری بکرێتەوە، ئەویش بە بەکارهێنانی ئەو هێزوتوانایەی کە لە (بڕگەکانی رێکەوتنامەی ساڵی ١٩٤٩ی ژنێڤو هەردوو پرۆتۆکۆلی پاشکۆی سەربار پەلنەهاوێژێ بۆ ئەو چالاکیانەی کە هەندێ گرووپ فەلسەفەی خۆیان لەسەر جێبەجێکردنی ئەو کردەوە تیرۆریستانەی کە دژی ژنانو منداڵانو هاووڵاتیانی بێ تاوانو رفاندنی فڕۆکەو بە بارمتە گرتن دارشتووە.[50]

چونکە ئەو توندتوتیژییەی کە شێوەی کردەوەی تارانباری وەردەگرێو لەگەڵ رەوشی مرۆڤایەتیدا یەکناگرێتەوە، ناکرێ بەکاری سیاسی لە قەڵەم بدرێو هەروەها نابێ پاساوی بۆ بهێنرێتەوەو سیفەتی رەوابوونی بەسەردا جێبەجێ بکرێ ئەگەر بەهۆی هەر پاڵنەرێکیشەوە ئەنجام بدرێ. لەبەر ئەوە مەبەستەکە پاساوێك نیە. بۆ گرتنە بەری ئەو شێوازو رێگەیە. پێویستە نیدانەی کردەوەی تاوان بکرێو چاوپۆشی لە پاڵنەرەکانیش بکرێ. وەکو چۆن پاڵنەری جوامێرانە نابێ ناکاری رەوابوون بەخشی بە هەندێ شێوازەکانی بەکار هێنانی توندوتیژی بە تایبەت کاتێك دژی بێتاوان ئاراستە دەکرێ.

(چونکە ئەو کردەوە بە تیرۆر دانانرێو یاسای نێودەوڵەتیش سزای لەسەر دانانێ ئەگەر پاڵنەری بەرگری بێ لە مافە دیاریکراوەکانی تاکەکانو مافی مرۆڤ و گەلانو مافی دیاریکردنی چارەنوس، مافی رزگارکردنی خاکە داگیرکراوەکانو بەرەنگاریو بەرپەرچدانەوەی داگیرکەر لەبەر ئەوە ئەو کردەوانە خۆیان لەبەردەم چەند مافێکدا دەبیننەوە کە یاسای نێودەوڵەتی بۆ تاکەکانو بۆ دەوڵەتان بریاری لە سەر داوە. چونکە

د . احمد محمد رفعت ، د . سالح بەکرتەلتەبیار ، وەرگێڕانی کوێستان جەمال ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ٧٤[50]

پەیوەست بە بەکارهێنانی ڕەوای هێزەوە دەبێ بە پێی برگەکانی ئەو یاسا نێودەوڵەتییانەوە کە لەسەری ڕێکەوتوون.)[51]

بۆ روون بوونەوەی زیاتر، خاڵە گرینگە جیاوازەکانی نێوان ئەو دوو چەمکە ئاماژە پێ دەکەین.

١) لە زۆربەی بارەوە فاکتەرو ئامانجی ئەنجامدانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی ڕاکێشانی سەرنجی رای گشتی جیهانی یە بەلای ڕەهەندو لایەنەکانی دۆزەکەیدا جیاواز لەو ئامانجانەی کە بکەرانی پرۆسەی توندوتیژی سیاسی ئەنجامی دەدەن.[52]

٢) تیرۆریزمی نێودەوڵەتی ئاراستەی بەرژەوەندی یەکی تایبەتی دەوڵەتێك یاخود دامەزراوێکی نێودەوڵەتی دەکرێ.[53]

٣) پرۆسەی تیرۆریزمی نێو دەوڵەتی لە هەندێ حاڵەتەکانیدا جەخت لەسەر کاریگەری لەسەر دەروونی جەماوەر دەکات لە کاتێکدا ئەم سووربوونە لە پرۆسەی توندوتیژی سیاسیدا بەدی ناکرێ.[54]

٤ ) تیرۆریزمی نێو دەوڵەتی لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ئامانجێکی سیاسی لەپشتەوەیەو هەندێك جار سنووری ئەو ئامانجە دەبەزێنێ‌و جیاوازی دانانێ لە نێوان چەکدارو مەدەنی‌و لەوێوە ڕەهەندێکی جیهانی بە پرۆسەکە دەبەخشێ.[55]

---

د . احمد محمد رفعت ، د . سالح بەکرتەلتەبیلر ، وەرگێڕانی کوێستان جەمال ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، سالی ٢٠٠٢ . ل ١٧٥ [51]

[52] تۆفیق عمر محمد ، سلمان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری پەسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، سالی ٢٠٠٢ ، ل ١٢٢

[53] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

[54] تۆفیق عمر محمد ، سلمان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری پەسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، سالی ٢٠٠٢ ، ل١٢٣

[55] تۆفیق عمر محمد ، سلمان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری پەسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، سالی ٢٠٠٢ ، ل١٢٤

هەرچی توندوتیژی سیاسیشە لە بـەدیهێنانی ئامـانجێکی سیاسـی دوور ناکەوێتـەوەو زۆرتر حالەتێکی ناوخۆیی هەیە تاکو ئاستێکی جیهانی.

٥ ) لەدیارترین دەرکەوتەکانی پرۆسەی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی رفاندنی فرۆکەو چاندنی بۆمبو دەست بەسەرداگرتنی بارمتەیە.[٥٦] {تیرۆرکردنی کەسایەتییە سیاسییەکان} کە لەناکامدا کاریگەری لەسەر رادەیەکی زۆری جەماوەر دادەنێ.

٢) جیاوازیی تیرۆریزمی نێودەوڵەتیو چالاکی بزووتنەوە رزگاریخوازیەکان

بە دوای سەرهەڵدانی دیاردەی ئیستیعماری (کۆلۆنیالیزمی) لـە دنیـادا جووڵانـەوەی رزگاریخوازی گەلانو بە شێوەیەك لە شێوەکان هاتە ئاراوە لە پێناوی بەربـەرەکانی کردنـی لەگەڵ ئەو هێزە ئیستیعماریانە کە نیشتمانیانی داگیر کردوە.

قسەی تێدا نیە کە هەموو ئەو دەوڵەتە کۆلۆنیالیستیانەکە بە درێژایی مێژوو سـەریان هەڵداوە لە پێناوی داگیرکردنی خاكو بەردەوام بوونو کەڵك وەرگرتن لـە سامانی گـەلان تێکڕای ئەو پرۆسە چەکداریانەی جووڵانەوە چەکداریەکان پێی هەڵدەستن دژ بە خۆیان و بە کاری تیرۆریستی دەزانن و دژ بە یاسای نێو دەوڵەتی لەقەڵەم دەدەن. ئەوەی کە ئاشکرایە بوونی ئاراستەیەکە بۆ جیاوازی کردن لە نێوان ئەو چالاکیانەی بزووتنەوە سیاسی یەکان لە پێناو زامن کردنی چارەنووسیان بـەرێوەی دەبـەنو ئـەو پرۆسانەی کـە دەوڵەتـە خـاوەن دەسـەڵاتەکان لە پێناو مانەوەی خۆیان لەسەر گەلانی ژێردەست پـەیرەوی دەکـەن کـە بـە هاندەرێکی تاوانی دادەنرێت لە بەرامبەری ئەوەش دا ئاراستەیەك هەیە کە جیاوازی ناکـا لە نێوان ئەو چالاکیەو پرۆسەیەداو هەموویان بە تێکڕا بە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لەقەڵەم دەدات. ئەزمرو بۆچوونەکانیش بۆ خودی جووڵانـەوە رزگاریخوازەکـان جیاوازییـان هەیـە، هەموو ئەو بزووتنەوانەی کە دەوڵەتان ئیعترافیـان پێـی کـردوە رێـڕای پرۆسـەکانیان بـۆ گەیشتن بە مافی چارەنوس بە کەرەستەیەکی شیاوو بەرهەق لەقەڵەم دەدەن، پێچـەوانەی

[56] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

ئەوەشی لە قەڵەم دانی تێکرای ئەو پرۆسانە بەکاری توندوتیژیو تیرۆریزم لە پێناو گەیشتن بەخاڵە جیاوازەکانی نێوان هەردوو پرۆسەی چالاکی بزووتنەوە رزگاریخوازەکانو تیرۆریزم پێویستە لە پێش دا لە سروشتی خەباتی رزگاریخوازی تێبگەینو رەهەندەکانی دیاری بکەین.

خەباتی رزگاریخوازی بریتییە لە هەموو ئەو چالاکییە چەکدارییانەی کە رەگەزە گەلییەکان پێی هەڵدەستن بە ئامانجی بەرپەرچ دانەوەی داگیر کردنی خاکی نیشتمانیان.[57]

ئەم جۆرە خەباتەش پەیوەستە بە مافی بڕیاردانی چارەنووس کە بەو مانایە دێت هەموو گەلان دەسەڵاتی بالایان هەبێ لە دیاری کردنی چارەنووسیان بەبێ دەست تێوەردانی بیانی.[58]

هەندێك لە نووسەرانی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو بەم شێوەیە شەڕی رزگاریخوازیان پێناسە کردوە: ئەو شەڕانەی کە بۆ بەرگریکردنی گەل دژی هێرشی بیانی هەڵدەگیرسێن، یاخود شەڕی رزگار کردنی گەلان لە کۆیلەیەتیو سەرمایەداری ، لەپاشان رزگار کردنی دەوڵەتە داگیرکراوەکان و ناسەربەخۆیەکان لە کاریگەری کۆلۆنیالیزمەکان.[59]

لە ژێر رووناکی ئەو چەند دەقەی سەرەوە دەگەینە ئەو راستی دا کە هەموو ئەو پرۆسانە بە مەبەستی بەدەستهێنانی مافێکە کە زەوت کراوە، دوور لە هەموو سیاسەتێکی پاوانخوازی بەڕێوە دەبردرێ کە دەکەونە بازنەی پرنسیپی مافی چارەی خۆ

[57] د . احمد محمد رفعت ، د . سالح بەکرنەلتمبیار ، وەرگێڕانی کوێستان جەمال ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، سالی ٢٠٠٢ ، ل١١

[58] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، سالی ٢٠٠٢ ، ل١٢٦

[59] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، سالی ٢٠٠٢ ، ل١٢٧

نووسین، لـە واقیـع دا ئازادیخوازەکـان لـە بنەرەتـدا بڕوایـان بـە بـەکارهێنانی ئـەوجۆرە توندوتیژی یە نییە، بۆ وێنە:

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە ڕێبەرایەتی بزووتنەوەی ڕەوای گەلی کـورد لـە کوردستانی ڕۆژهەلات دەکاو خاوەنی کۆمـاری کوردسـتان و٦١سـال خـەباتی بێوچـاونە هەمیشە گوتویەتی‌و باوەڕیشی بـەو ئەسـڵە بـووە (کـە مەسـەلەی کـورد لـە ئێـران دا ڕێگاچارەی نیزامـی (عسـکری) نیـە بـەڵکو ئاخریەکـەی ڕێگایـەکی ئاشـتیخوازانەیە).

بەداخەوە لەو نییەت پاکـەی حیزبی دێمـوکرات، کۆمـاری ئیسـلامی کـەلکی وەرگـرت‌و سکرتێری گشتی حیزب دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو نوێنـەری ئەوحیزبە عبدالا قـادری‌و کەسێکی دیکە بە ناوی دوکتور فاضل ڕەسوڵ لە ڕێکەوتی ١٣٦٨/٤/٢٢ی هـەتاوی لـە ڤیەن لە سەر مێزی وتووێژ بە دەستی تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی شەهید کران.[٦٠]

بەڵام لە هەمان کاتدا بە یەکێك لە ڕێگەکانی چارە سەری دۆزەکەی دادەنێن. بۆ ئەوەی کە دەسەلاتدارانی حـاکم مـل بـۆ ویسـت‌و داخوازییـەکانیان ڕاکێشـن. لـە سـاڵی ٧٥ــ ١٩٧٤ەوە وەفدی پارتی دێموکراتی کوردستانی عێراق بە سەرۆکایەتیی حەبیب کەریم کە بۆ وتووێژ لە بەغدا بوون لە ئاخری کۆبوونەوەکەدا سەدام حسین رووی کردە حەبیب کەریم‌و گوتی ئازانم تۆ کێی‌و نوێنەری کام هێزی کە ئەو داواکاریـانە لە من دەکەی، لـە وەڵام دا حەبیب کەریم گوتی: (مـن نوێنەری ئەو هێزەم کە لەو شاخەیە‌و تۆی وادار کردووە کە مـن بانگ بکەیە سەر ئەو مێزە)[٦١]

ئەوەی ئەو ئاکامە بە هێز دەکا ئەو پشگیری یە یاسایی یە نێودەوڵەتییە کـە میسـاقی ڕێکخراوە نێودەوڵەتیـەکان‌و ژمارەیەك لە بەیانـامـەو ڕێکەوتنامـە نێودەوڵەتی‌یـەکان بـە چەندین بڕیار تەئکیدیان لە پرەنسیپی مافی چارەنووسی گـەلان کـردوەو پێشـگیری لـە

---

[60] حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ، بەلگەنامەکانی کۆنگرەی حەوتەم ، ساڵی ١٣٦٢ ل ٤٢

[61] کریس کۆچێرا ، مێژووی کورد لە سەدەی ١٩ هەتا ٢٠ ، وەرگێرانی محمد ریانی

هەموو ئەو پرۆسانەی کردوە کە بەو میحوەرانەدا گیراونەتە بەر. بۆ نموونە لە برگەی ۲ی مادەی یەكو مادەی ٥٥دا ئاماژە بە گرینگی مافی چارەی خۆنووسین کردوە.

لە خەباتی رزگاریخوازیدا نابێ زیان بە کەسانێك بگەیەنرێ کە هیچ پەیوەندییەکی بەو ململانێو ناکۆکیانەوە نیە، وەك رفاندنی فرۆکەی نەفەرهەڵگرو هەستان بە ئەنجامدانی تەقینەوە دژی گیانی هاوولاتیانو پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤو کوشتن، بە ئامانجی تێکدانی ئاسایشو بلاوکردنەوەی ترسو دڵەراوکێ.[٦٢] لە ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیەدا هەرکاتێك لە یاساکانی شەڕ دەرچوون هەبێ یاخود لە یەکێك لەو حاڵەتانەی سەرەوەدا لادان هەبێ ئەوە رەوایی خۆی لەدەست دەداو دەچێتە خانەی توندوتیژیو کاری تیرۆریستی یەوە. کورتەی کەلام کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لە زۆربەی ئەو رێکەوتننامەو میثاقی رێکخراوە نێودەوڵەتییانە دا پشتگیری لە چالاکی بزووتنەوەی رزگاریخوازەکان دەکا. لە حاڵێك دا تیرۆریزم مەحکووم دەکاو بە کردەوەیەکی دژی مرۆڤایەتی دەزانێ.

[62] تۆفیق عمر محمد، سامان احمد محمود، زانا جلال سعید، گۆڤاری یاسا، ژمارە ۷-۸، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ۲۰۰۲، ل۱۳٦

# بەشی سێهەم

# تیرۆریزم وەك دیاردەیەکی نێو دەوڵەتی

## بەندی یەکەم:

## هەوڵەکانی بنبڕکردنی تیرۆریزمی نێو دەوڵەتی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان

دوای شەڕی یەکەمی جیهانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی تێکۆشا بۆ بەدیهێنانی ئاشتییەکی سەرتاسەری لە دنیادا، لە ڕێگای پێکهێنانی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیەوە کە دەوڵەتان بەشداریی تێدا بکەن لە پێناو قەرەبووکردنەوەی ئەو زەرەرو زیانانەی لە ئاکامی شەڕدا کەوتبوونەوە. ئەو ڕێکخراوەش ناوی لێ نرا (کۆمەڵی نەتەوەکان) (جامعەمللی - عصبەالامم) دامەزراندنی کۆمەڵی نەتەوەکان ئاکامی ئەو هەوڵانە بوو کە لە ئاستی نێونەتەوەییدا دران. لە پێناو ئارامکردنەوەی و پاراستنی ئاشتی نێودەوڵەتی. وێڕای کاریگەرییەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی، هاندەری سەرەکی بوون بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی بۆ ئەوەی لەو بوارەدا ڕۆڵی بەرچاوی خۆی لە پێشگرتن لە شەڕو مەرگو ماڵوێرانی بگێڕێ. لە گەڵ ئەوەی جەنگی جیهانیی یەکەم بە تیرۆرکردنی والیی عهدی ئەمساوی (نوتریش) لە لایەن تیرۆریستێکی سربیەوە هەڵگیرسا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هیچ ئامادەکارییەك بۆ کۆنترۆلکردنی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی نەگیرایە بەر هەتا سەرەتای هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی دووەم.[٦٣]

---

[63] توفیق عمر محمد، سامان احمد محمود، زانا جلال سعید، گۆڤاری یاسا، ژمارە ٢٠٨، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢، ل١٢٤

یەکەم، بایەخدان بە تیرۆریزم لە ئاستی جیهانی لە نێوان لێکۆڵەرەوەکان لە کۆنگرەی جیهانیی سێهەم دا کە تایبەت بوو بە یەکخستنی یاسای تاوان لە بروکسێل لە ساڵی ١٩٣٠و لە کۆنگرەی چوارەمی پاریسیش لە ساڵی ١٩٣١ سەری هەڵدا.

(جێی ئاماژەشە کە کۆنگرەی پێنجەم کە لە مادرید لە ساڵی ١٩٣٤دا بەسترا تیرۆریزمی بە دوو بەش پۆلێن کرد. یەکەم: تیرۆریزمی سیاسی‌و، دووهەم تیرۆریزمی کۆمەڵایەتی.) [64]

لە کۆنگرەی سێهەمی بروکسێلدا ساڵی ١٩٣٠، جەخت لە سەر ئەوە کراوەتەوە کە تیرۆریزمی سیاسی ئەو تاوانانەن کە بە دژایەتی رێکخستنی ئەفکاری سیاسی ئەنجام دەدرێن لە سەرتاسەری جیهاندا و، کۆنگرەی چوارەمی پاریس لە ساڵی ١٩٣١دا تاوانی تەقاندنەوەی کە زیانێکی گەورە لە گیان‌و ماڵ دەدا بە پرۆسەی تیرۆریزم ناساندوە کە ئامانجی تێکشکاندنی دەزگا سیاسییەکانی کۆمەڵگایە لە رێگای بەکارهێنانی توندوتیژییەوە، کۆنگرەی پێنجەم مادرید ساڵی ١٩٣٣ تاڵان‌و تێکدان‌و بەکارهێنانی توندوتیژی لە چوارچێوەی تیرۆریزمی سیاسی‌دا دابەش کردوە. [64]

لە راستیدا دیاردەی تیرۆریزم گرنگی پێدانێکی ئەوتۆی بە خۆوە نەدی کە سنووری سیاسی ببەزێنی هەتا دوای رووداوی تاوانی کوشتنی مەلیکی یوگسلافی (الکساندری یەکەم)و سەرۆك وەزیرانی فەرەنسی (لویس پارتو Louis Barthau) لە مێرسێلیا، کە لە ساڵی ١٩٣٤ رووی دا. [66]

---

هەمان سەرچاوەی سەرەوە

تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٣٥ 65

د . احمد محمد رفعت ، د . سالح بەکرتەلتەیبار ، وەرگێرانی کوێستان جەمال ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ٦٨ 66

ساڵی ١٩٣٤ ئەنجومەنی کۆمەڵی نەتەوەکان بە تێکڕای دەنگ بڕیاری دا بە پێکهێنانی کومیتەیەك لە پسپۆڕان بۆ دامەزراندنی پرۆژەی ڕێککەوتنێکی نێودەوڵەتی بۆ بەرگری کردن لە ڕوودانی هەر چەشنە کردەوەیەکی تیرۆریستیو خاشەبڕکردنی تیرۆریزمو دۆزینەوەی بکەرانی بە مەبەستی لە ناوبردنی دیاردەی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی.

لە ساڵی ١٩٣٦دا داوای پێداچوونەوەی ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردنو لە ناوبردنی تیرۆریزم، کۆمەڵی گشتی بڕیارێکی دا کە ئوسوولو پرنسیپەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیەی لە خۆ گرتبوو سوور بوو لە سەر قەدەغەکردنی دەستێوەردانی هەر دەوڵەتێك لە ژیانی سیاسیی دەوڵەتێکی دیکەدا.

تاکە هەوڵێکی دیاریش لە سەردەمی کۆمەڵی نەتەوەکاندا بە ئاراستەی قەدەغەکردنو سزا خستنە سەر تاوانبارانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٣٧ی ژنێف بوو.[٦٧]

ڕێککەوتننامەی ژنێڤ لە دیباچەیەكو (٢٩) مادە پێك هاتووە کە بە تێکڕا جەخت لە سەر گرنگیی هاریکاریی نێودەوڵەتی بۆ بەگژداچوونی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی دەکا.

هەرچەندە لە ڕابردوودا هەوڵی زۆر دراوە بۆ بەرگریکردنو بنبڕکردنی تیرۆر، ئەو هەوڵانە قۆناخی جۆراوجۆریان بڕی تا ڕادەیەك لە کەمکردنەوە بنبڕکردنی چوونە پێش. لێرەدا وێڕای ئاماژەکردن بەو هەوڵانە، ئەو هۆکارانەش کە دبنە هۆی بەربەستو بنبڕکردنی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی دەخەینە بەرچاو.

١- ئیدانەکردنی کۆمەڵی گشتی بۆ هەموو ئەو پرۆسە تیرۆریستییە نێودەوڵەتیانەی کە ژیانی مرۆڤایەتی دەخەنە مەترسییەوە یا خود هەڕەشە لە ئازادییە بنەڕەتییەکان دەکەن.

[67] توفیق عمر محمد، سامان احمد محمود، زانا جلال سعید، گۆڤاری پاسا، ژمارە ٧-٨، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢، ل١٣٦

٢- ئاگایی دەوڵەتان بۆ بەشداریی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ نەهێشتنی فاکتەرەکانی پشت تیرۆریزمی نێودەوڵەتی.

٣- سووربوونی دەوڵەتان بۆ هاریکاریکردنی یەکتر لە رووی گۆڕینەوەی زانیاری بۆ رێگرتن لە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی.

٤- هاندانی گشت دەوڵەتان بۆ ئەندام بوون لە رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە گیروگرفتی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی.

٥- کۆمەڵی گشتی ئامادەکاریی هەبێ بۆ مۆرکردنی رێککەوتننامەی دیکە بۆ ئەو حاڵەتانەی کە رێککەوتننامەکانی دیکەی تایبەت بە بنبڕکردنی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی نەیگرتوونەتە خۆ.[٦٨]

٦- پێناسەکردنی تاوانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی تاوانبارکردنی لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی لە رێگەی پەیماننامەی نێودەوڵەتییەوە.

٧- بنبڕکردنی فاکتەرەکانی تیرۆریزم لە جیاوازی رەگەزی لە نێوان گەلەکانو دوژمنایەتیو دەستێوەردانی لە کاروباری نێوخۆیی دەوڵەتەکانو داگیرکردنی خاكو دەربەدەرکردنی کۆمەڵی دانیشتوانو پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤو لەبەرچاونەگرتنی مافی کەمایەتییەکانو رێزنەگرتن لە مافی چارەی خۆنووسینی گەلان.

٨- هێنانە کایەی دادگای تاوان بۆ دادگاییکردنی تاوانبارانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی.

٩- بەهێزکردنی بنکەی تەسلیم کردنەوەی تاوانباران لە یاسای تاوانی دەوڵەتە جیاوازەکاندا، لەگەڵ مۆرکردنی پەیماننامەی نێودەوڵەتی لە ئاستی دوەلیوکۆمەڵی تایبەت بە تەسلیم کردنودادگاییکردنی تاوانبارانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی.[٦٩]

---

[68] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٤٢

[69] تۆفیق عمر محمد ، سامان احمد محمود ، زانا جلال سعید ، گۆڤاری یاسا ، ژمارە ٧-٨ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٤٧

١٠- بانگەوازی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بکرێ بۆ پەیوەست بوونی بابەتیانە لە کاتی ورووژاندنی مەسەلەکەدا.

١١- بانگەشەی گشت ڕۆشنبیران بکرێ لە هەر شوێنێك بن بۆ بینینی ڕۆڵی خۆیان لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دیاردەی دزێوی تیرۆریزم.

١٢- بانگەشەی دەزگا پەروەردەیی‌یەکان بکرێ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی تیرۆریزم هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی هزرییەوە.[٧٠]

١٣- لە پێناو بنبڕکردنی پرۆسەکەدا ئەو کەلێنەی کە لەو ناقارەدا بەدی دەکرێت نەتوانینی ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانە بۆ هێنانەکایەی ڕێساو یاسایەکی ئەوتۆ کە تێکڕای دەوڵەتان ناچار بکا کە پێیەوە پابەند بن. فاکتەری سەرەکیی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لە بەرچاوگرتنی بەرژەوەندییە تەسکەکانو فاکتەری سیاسیو ئابووری.

١٤- جگە لەمەش، گرنگی پێنەدانی دەوڵەتان بۆ بنبڕکردنی پرۆسەکە لە لایەکی دیکەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەیرکردنی خودی پرۆسەکە وەك تاوانی ئاسایی، سەرئەنجامیش چارەسەرکردنی گەڕاوەتەوە بۆ دادگا نێوخۆییەکان.[٧١]

١٥- لە ڕووی یاساییەوە کە سەروەریی خزمەتی بە هەموو لایەكو بە بەرژەوەندیی گشتی دەکا، هاوکوفیو گونجانو سازانێك بخرێتە بواری پراکتیکەوە بۆ ڕێگەگرتن لە تیرۆر، واتە بە جۆرێك بەرقەرارکردنی یاسا کە خزمەت بە بەرژەوەندیی گشتی بکا، کە لە هەمان کاتدا ڕێگرتنە لە دیاردەی تیرۆرو تەشەنەکردنی ئەو ئافاتە.[٧٢]

---

توفیق عمر محمد، سامان احمد محمود، زانا جلال سعید، گۆڤاری یاسا، ژمارە ٧-٨، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢، ل١٥٠ [70]

توفیق عمر محمد، سامان احمد محمود، زانا جلال سعید، گۆڤاری یاسا، ژمارە ٧-٨، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢، ل١٥٥ [71]

مامۆستا لقمان عمر حسین، گۆڤاری ئەمڕۆو، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٤، ژمارە ٢١ - ٢٠، ل ٣٦ [72]

## بەندی دووەم:

### هەڵوێستو بیروڕای نێونەتەوەیی

### سەبارەت بە تیرۆریزمی نێودەوڵەتیو هەوڵدان بۆ ریشەکێشکردنی

(لەو وتووێژانەی کە لە خولی بیستو حەوتەمی کۆمەڵەی گشتیدا بەڕێوە چوو، نوێنەرانی ۹۳ دەوڵەتی ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان لە وتەکانیاندا، ئاماژەیان بە بڵاو بوونەوەی دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتی کرد. داوای هەوڵو هاوکاریی کۆمەڵی نێو دەوڵەتییان کرد. لە پێناوی گەیشتن بە رێگە چارە بۆ قەدەغەکردنو بنبڕکردنی کردەوە تیرۆریستی یەکان.)[73] هەرچەند نوێنەرانی دەوڵەتان تەبا بوون، لە سەر ئیدانەکردنی تیرۆر وەکو ئامرازێك لە ئامرازەکانی توندوتیژیی سیاسی، کەچی لەو وتووێژانەدا، سەبارەت بە بیرۆکەی تیرۆرو ئامرازەکانی بنبڕ کردنی بە لەبەرچاو گرتنی جیاوازیی سیاسەتە نیشتیمانییەکانی هەر یەکێك لەو دەوڵەتانە، بۆچوونی جیاواز لە نێوانیان دا دەرکەوت، دەکرێ وتووێژەکان بە سێ بۆچوونی سەرەکی بەم شێوەی خوارەوە دابەش بکەین.

١ـ بۆ چوونێك کە بنبڕکردنی تیرۆرو سزادانی هەرجۆرێك لە جۆرەکانی بەکار هێنانی هێز یان توندوتیژی بە شێوەی گشتی بە پێویست دەزانێ و ئەم بۆچوونەش هەر یەك لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو دەوڵەتانی رۆژئاوا رێبەرایەتی دەکەن.

٢ـ بۆچوونێك کە پشتگیریی ئیدانەکردنی کردەوە تیرۆریستییەکان دەکاو بە پێویستی دەزانێ کە کۆتایی بەو هۆیانە بهێنن کە دەبنە هۆی بەکارهێنانی توندوتیژیو کردەوەکانی تیرۆر. وڵاتانی عەرەبیو دەوڵەتانی ئەفریقاو ئاسیا رێبەرایەتی ئەو بۆچوونە دەکەن.

٣ـ بۆچوونی سێیەم جیاوازیی دەکا لە نێوان توندوتیژی کە بەکار دەهێنرێ وەکو ئامرازێك بۆ پراکتیزە کردنی مافی دیاریکردنی چارەنووسو ئازادبوون لە داگیرکەرو، کار

[73] د. احمد محمد رفعت، د. صالح بەکرتەلتەبیار، وەرگێڕانی کوێستان جەمال، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانە رەنج، ساڵی ۲۰۰۲، ل۱۸۵

تاوانکارییەکانی تیرۆر کە دژی بێ تاوان ئەنجام دەدرێ، یان کۆسپ دەخاتە بەردەم چالاکیی دیپلۆماسی یان نوێنەرانی دەوڵەت یان ئەندامانی شاندە دیپلۆماسیەکانو هۆیەکانی پەیوەندیی نێوانیان دەکەنە ئامانج کە لە خزمەتی هیچ ئامانجێکی رەوادا نیە. بەڵکوو زیانی گیانیشی لێ دەکەوێتەوە، ئەم بۆچوونەش یەکیەتیی سۆڤیەتی جارانو بلووکی رۆژهەڵات سەرکردایەتی‌یان دەکرد.[٧٤]

بەلام لە ساڵی ١٩٧٢وە ئەتەوە یەکگرتووەکان هەڵمەتەکەی لە دژی تیرۆری نێودەوڵەتی چڕ کردەوە، لەو بارەوە چەندین بڕیار لە کۆمەڵەی گشتیی ئەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرچوو کە ئیدانەی تیرۆری نێودەوڵەتی دەکەنو هانی وڵاتان دەدەن بۆ هاوکاری لە پێناو بنبڕکردنو سزادانی ئەنجامدەرانی کردەوەی تیرۆریستی.

١ـ بڕیاری ١٠٢ خولی٣١کە لە ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٦دا دەرچوو.

٢ـ بڕیاری ١٤٧ خولی ٣٢ کە لە١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٧دا دەرچوو.

٣ـ بڕیاری ١٤٥ خولی ٤٣ کە لە ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٩دا دەرچوو.

٤ـ بڕیاری ١٠٩ خولی ٣٦ کە لە ١٠ی کانونی یەکەمی ١٩٨١دا دەرچوو.

٥ـ بڕیاری ١٣٠ خولی ٣٨ کە لە ١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٣دا دەرچوو.

٦ـ بڕیاری ١٥٩خولی ٣٩ کە لە ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٨٥دا دەرچوو.

٧ـ بڕیاری ٦١ خولی ٤٩ کە لە ٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٧دا دەرچوو.

٨ـ بڕیاری ١٥٩ خولی ٢٤کە لە ٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٧دا دەرچوو.

٩ـ بڕیاری ٢٩ خولی ٤٤ کە لە ٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٩دا دەرچوو.

١٠ـ بڕیاری ٥١ی خولی ٤٦ کە لە ٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٩١دا دەرچوو.[٧٥]

---

. . احمد محمد رفعت ، د . سالح بەکرئەلتەیبار ، وەرگێڕانی کوێستان جەمال ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ١٨٦ [74]

. . احمد محمد رفعت ، د . سالح بەکرئەلتەیبار ، وەرگێڕانی کوێستان جەمال ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ١٨٢ [75]

لە خولی بیستو حەوتەم لە هەشتی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٢دا سكرتێری گشتیی نەتەوە یەكگرتووەكان داوای كرد كە مەسەلەی (گرتنەبەری رێوشوێن بۆ ئامانجی قەدەغەكردنی تیرۆرو شێوەكانی دیكەی توندوتیژی كە ژیانی بێتاوانان روبەڕوی مەترسی دەكاتەوە یان پێشێلكردنی ئازادییە بنەڕەتییەكان لە خشتەی كارەكانیاندا دابنرێو رەوانەی لیژنەی شەشەم (یاسایی) بكرێ. بۆ ئامادەكردنی راپۆرتێك لەو بارەیەوە سكرتێری گشتی لە وتارەكەیدا كە لە بەردەم لیژنەی كۆمەڵەی گشتی لە ٢٠ی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٢دا روونی كردەوە. كاتێك كە داوای دانانی ئەو مەسەلەیەی لە خشتەی كارەكانی كۆمەڵە، لە خولی بیستو حەوتەمدا كرد. رووداوی كارە توندو تیژییە ئاراستە كراوەكانی دژی سەركردە نیشتمانیو نێردراوە دیپلۆماسییەكانو گەشتیارانو دژی بێ تاوانی تری رەچاو كرد، ئەو كردەوانەش بووە هۆی بڵاو بوونەوەی ترسو دڵەراوكێ لە جیهاندا كە دەربباز بوون لێی نەستەمە.[٧٦]

هەروەها سكرتێری گشتی قەناعەتی خۆی دەربڕی بەوەی كێشەی تیرۆر كێشەیەكی زۆر ئاڵۆزەو ژمارەیەك لە حكومەتەكان دوچاری ئەستەم بوونەتەوە لە دیاریكردنی هەڵوێستیدا كە پێویستە بگیرێتە بەرو لە رووبەڕوو بوونەوەیدا هەر لەبەر ئەوەش هەستیان كرد كە ناچارن لە خشتەی كارەكانی كۆمەڵەی گشتیدا داوای دانانی ئەو مەسەلەیە بكەن. بە تێڕوانینی ئەو نیگەرانیو دڵە راوكێ قووڵەی كە هەموو لایەك هەست بە مەترسی ئەو دیاردەیە دەكەن. بە تێڕوانین لەوەی كە گۆرەپانی ئەو چالاكییەو پاڵنەرەكانی بە شێوەیەكی زۆر مۆركی نێو دەوڵەتی بەدەست دەهێنێو لە بەر ئەوەی كە پێشكەوتنی تەكنۆلۆژی رەهەندێكی نوێ بەم دیاردە كۆنە بەخشی.[٧٧]

---

[76] د . احمد محمد رفعت ، د . صالح بەكر ئەلتەییار ، وەرگێڕانی كوێستان جەماڵ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل١٨٤

[77] د . احمد محمد رفعت ، د . صالح بەكر ئەلتەییار ، وەرگێڕانی كوێستان جەماڵ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ١٨٤و١٨٥

١) هوڵەندا لە جیاتی ئورووپا:

نوێنەری هوڵەند پابەندبوونی ئەندامانی کۆمەڵەی ئورووپای دەربڕی بۆ بڕیارە پێوەندیدارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئیدانەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی.[٧٨]

٢) ئارژانتین:

نوێنەری ئارژانتین ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە لە خولی چلوچوارەمی کۆمەڵەی گشتیدا ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان ئیدانەی هەموو شێوەکانی تیرۆری نێودەوڵەتییان کرد.[٧٩]

٣) لیبی:

نوێنەری لیبی ئاماژەی بۆ ڕێکخستنی هەوڵەکانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی کرد. لەو کاتەوە کە پرۆسەی تیرۆر دەستی پێ کردو ڕوو لە زیاد بوونو بەر بڵاو بوون بۆوە. بە هەموو شێوازەکانیەوە بە تایبەتی تیرۆری دەوڵەتو تیرۆری تاك (فەرد) کە هەڕەشە لە ئاسایشو ئاشتی و سەقامگیری نێو دەوڵەتی لەق دەکا. کە سەرجەم دەوڵەتان تەئکیدی لە سەر دەکەنو هەوڵی چەسپاندنی دەدەن لە ڕێگەی بانگەوازەکانەوە بۆ پەرە پێدانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانو پتەو کردنی ڕۆڵی بە دیهێنانی ئاواتو ئامانجی گەلانو گەیشتن بە مەبەستەکانیان لە پێناو کۆتاییهێنان بە دیوەزمەی تیرۆر کە بۆتە هۆی نائارامی جیهانو هەرەشە لە سیستەمە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکانو ژیانی بێ تاوانان لە هەموو شوێنو کاتێکدا دەکا. (هەروەها ئاماژەی بەو تیرۆرە کرد کە بەسەر گەلی فەلستینو لە سەر گەلانی دیکەوەیە [گەلی کورد] کە گەلی فەلەستین ڕۆژانە ڕووبەڕووی هەموو جۆرەکانی ئەشکەنجەو کوشتن دەبنەوە بە شێوەیەکی بەرین، ئاوارە بوونو تیرۆرکردنی سەرکردەکانیان بە مەبەستی دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەیان لە خاکە

---

78 د . احمد محمد رفعت ، د . صالح بکرنەلتەبیار ، وەرگێڕانی کوێستان جەمال ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ٢١١

79 د . احمد محمد رفعت ، د . صالح بکرنەلتەبیار ، وەرگێڕانی کوێستان جەمال ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل ٢١١

داگیرکراوەکانو درێژەی بە قسەکانی داو گوتی: وڵاتەکەی ئیدانەی تیرۆر دەکاو داوا لە کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی دەکا بەرەنگاری ببنەوەو ڕێگەی لێ بگرن تاکو گەلی فەلەستین بتوانێ مافە بنەرەتیو ڕەوا نیشتمانییەکانی دەستەبەر بکا. هەر وەها ئیدانەی هەموو جۆرە کارێکی تیرۆریستیانە دەکا.[80]

٤) کوێت:

نوێنەری دەوڵەتی کوێت گوتی: هەموو ئەو هەوڵانە تەئکید لە سەر پێویستی ئیقداماتی جددی دەکەنەوە، بۆ کۆتایی هێنان بەو دیاردەیە. لەلایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە ئەویش (بە بەرپەرچ دانەوەی ڕژێمە هاوشێوەکانی ڕژێمی عێراق کە لەسەر تیرۆرو زوڵمو کوشتنو تۆقاندن دامەزراوە، نەك تەنها لە دژی دەوڵەتانی دراوسێی بەڵکو لە دژی گەلەکەیشی پیادەی کردوەو گەلەکەی کردۆتە قوربانیی یەکەمی کارە تیرۆرییەکانیو جەختی لە سەر ئەوە کرد کە ئەوە تەنها بە هاوکاریی نێو دەوڵەتیو مل نەدان بە کارە تیرۆریستی یەکانو مانەوەو جێگیریی لە سەر دابو نەریتی بەربەرچدانەوەی تیرۆرو تیرۆریستان بەدی دێت.)[81]

٥) وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:

(نوێنەری ئەمریکا گوتی ئەو ڕۆژانە بەسەر چوو کە کەمینە لە شاندەکان کار بۆ ئەوە بکەن کە مەرجی دیاری کراو دابنێین. بەر لە ئیدانەکردنی شێوە جیاوازەکانی تیرۆر. ئەمرۆ پێوەندیەکی نێو دەوڵەتی لە هەڵوێستی شاندەکاندا هەیە بەرامبەر بە ئیدانە کردنی تیرۆر. لەو بارەوە ئاماژەی بەو ڕێککەوتننامە نێو دەوڵەتیانە کرد کە لە بواری بنبڕکردنی تیرۆردا دەرچوون لەوانە.

د. احمد محمد رفعت، د. سالح بەکرتەلتەبیار، وەرگێرانی کوێستان جەمال، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢، ل٢١١ و ٢١٢ [80]

د. احمد محمد رفعت، د. سالح بەکرتەلتەبیار، وەرگێرانی کوێستان جەمال، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٢، ل ٢١٢ [81]

أ/ ڕێکەوتننامەکانی نەهێشتنی دەستێوەردانی نایاسایی لە خزمەتگوزارییەکانی فڕینی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا.

ب/ ڕێکەوتننامەکانی پاراستنی دیپلۆماسییەکانو ئەو کەسانەی مافی پاراستنی نێودەوڵەتییان هەیە.

ج/ ڕێکەوتننامەی بەرەنگار بوونەوەی بە بارمتە گرتن.

د/ ڕێکەوتننامەی قەدەغەکردنی کردەوەکانی تیرۆریستی لە نۆقیانووسەکاندا.

٦) یەکیەتیی سۆڤیەتی جاران:

یەکیەتی سۆڤیەت تیرۆری نیدانە کرد، بە هەموو شێوازەکانو هۆکارەکانی کە لە پشتەوەی پرۆسەی تیرۆرن، هاوکات لەگەڵ ئەوە داوای لە وڵاتان کرد کە هیچ جۆرە یارمەتییەك پێشکەش بە تیرۆریستان نەکەن. هەروەها هانی هەموو وڵاتانی دا بۆ ئەوەی ڕێو شوێنی کاریگەرو یەکلاکەرەوە بگرنە بەر لە پێناوی بنبڕکردنی خێراو یەکجارەکی تیرۆری نێودەوڵەتی بە شێوەی خوارەوە.

ا/ (ڕێگەنەدان بە ئامادە کردنو ڕێکخستنی ئەو کارانەی کە دەخوازن لە ناو خاکەکەی یان دەرەوەدا ئەنجام بدرێ لە کاری تیرۆریستانە وێرانکاری کە دژی وڵاتانی دیکەو هاووڵاتیان بەرێوە دەبەن.

ب/ هەوڵدان بۆ دەستگیر کردنی بکەرو بەرێوەبەرانی کارە تیرۆریستی یەکان تەحویل دانیانو بۆ دادگایی کردنو سزادان.

ج/ هەوڵدان بۆ بەستنی ڕێکەوتننامە تایبەتییەکان بۆ ئەو مەبەستە بە شێوەی دوو قۆڵیو ناوچەییو چەند لایەنی.

د/ بۆ هاوکاریکردنی دەوڵەتان لەگەڵ یەکتر لە پێناو بەرگریکردن لە تیرۆرو بنبڕکردنی دا ئاڵوگۆڕکردنی زانیارییەکان لەو پێوەندیەدا بە خاڵێکی سەرەکی دادەنرێ.[82]

ه/ هەموو هەنگاوە پێویستەکان بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان. بە شێوەیەکی خێرا عەمەلی بکرێن سەبارەت بەو بابەتە کە دەوڵەتان تێدا دەبن بە ئەندام. بە پێی گونجاندنی ئەو یاسا نێوخۆییانەو ڕێککەوتننامانەی کە لە نێوانیاندا هەن.[83]

سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵانە ئێستا دیاردەی تیرۆر بۆتە نەخۆشییەکی مەترسیدار کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی گرتوە. ئەو پرۆسەیە کاتێك دەتوانرێ لە ناو بچێو بەرگری بکرێ کە هەموو وڵاتەکان نەك بە قسە بەڵکوو بەکردەوە هەنگاوی بۆ هەڵگرن. قازانجو بەرژەوەندی یە تەسکەکانی بازرگانیو ئابووریو پاوانخوازی وڵاتەکان. هەر کاتێکیش وڵاتێك سەر پێچی کرد بە زووترین کات ئیجرائاتی یاسایی لەگەڵ بکرێ، نەك چاو پۆشی لێ بکرێ. نموونەی هەرە بەرچاو کۆماری ئیسلامیی ئێرانە کە بە شێوەیەکی حاشاهەڵنەگر ماکەی تیرۆرو ڕژێمێکی تیرۆریست پەروەرە کەچی تا ئێستا بە شێوەی پێویستو عەمەلی ئیجرائاتی لەگەڵ نەکراوە... .

لە بەشی چوارەمی ئەو کتێبەوە دەست دەکەین بە شیکردنەوە و پەردە لادان لە سەر ڕووی دزێوی کۆماری ئیسلامی کە چۆن ماکەی تیرۆرە لە ئاستی جیهانی دا بەگشتیو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی. ڕژێمێك کە لە لایەك باس لە دونیای پێشکەوتەکانو کۆمەڵگای مەدەنی دەکاو لە لایەکیتر لە دادگایەکی مرعتەبەری ئوورووپاییدا سەرانی ئەو حکومەتە بە گەڵاڵەدارێژەرو دەستووردەرانی پیلانی تیرۆری میکۆنووسو قاتڵی دوکتور شەرەفکەندیو هاوڕێیانی بە جیهان دەناسێنرێ.

---

[82] د . احمد محمد رفعت ، د . سالح بەکرتەلتەیهار ، وەرگێڕانی کوێستان جەماڵ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل٢٦٥

[83] د . احمد محمد رفعت ، د . سالح بەکرتەلتەیهار ، وەرگێڕانی کوێستان جەماڵ ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، ساڵی ٢٠٠٢ ، ل٢٦٨

# بەشی چوارەم

## "تاوان، لێکۆڵینەوە"

### بەندی یەکەم

- قاسملوو لە تریبوونی کۆنگرەی ئەنتێرناسیۆنالی سۆسیالیست هەوڵی نێونەتەوەیی کردنی کێشەی کورددەدا
- مێژوو بەسەرهاتی قاسملوو
- لەبیرەوەری شەوی یەلدا
- شەرەفکەندی ژیان‌و تێکۆشان
- دیسان تاوان
- شەرەفکەندی بۆ دیالۆگ نەك بۆ مەرگ
- چۆنیەتیی کارەساتێکی دوور لە یاسا

### بەندی دووهەم

- چارەسەری کێشەکە لە ڕوانگەی یاسای نێوخۆیی ئاڵمان
- پرس‌و لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان
- چۆنیەتیی لێکۆڵینەوە لە دۆزی میکۆنووس
- ئیقرارو ئیعتراف بە تاوان

### بەندی سێهەم:

- دابینکردنی عەدالەت یان پاراستنی بەرژەوەندییەکان
- پەیامی دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران
- میکۆنوس بۆ مێژوو

# بەشی چوارەم

## "تاوان، لێکۆڵینەوە"

### بەندی یەکەم:

### قاسملوو لە تریبوونی ئەنتێرناسیۆنالی سۆسیالیست
### هەوڵی نێونەتەویی کردنی کێشەی کورددەدا

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ناکامی هەوڵ و تیکوشانی دوکتـور "قـاسملو"دا لـە کۆنـەوە پێوەنـدیی دۆستانەی لە گەڵ بەشـێکی بەرچـاوی حیزبــە ســوسیالیســتو ســۆســیال دێموکراتــەکانی ئــەورووپای رۆژئــاوا هەبووە، لـە رێگـای ئـەو دۆسـتانەوە دوکتـور وەك کەسـایەتیەکی زانسـتی ئەکادمی هەوڵێکی زۆر دا کە حیزبی دێـموکرات دەرگـای کـۆنگرە و کۆبوونـەوەکانی ئەنترناسـیونالی سۆسیالیسـتی بـۆ بکرێتـەوە، لـەو

تریبۆنەوە کێشەی کورد نێونەتەوەیی بکا. سەرەنجام ئەم زەحمەت و ماندوبوونە بە ئاکام گەیشت و ساڵی ١٩٨٦ دوکتور قاسملوو بۆ خۆی وەك نوێنەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوو بە میوانی حەڤدەهەمین کۆنگرەی ئەنترناسیۆنال کە لە لیما پایتەختی وڵاتی پێرو لە ئەمریکای لاتین پێك هات.

جاری دووهەم دوکتور قاسملو لە کۆنگرەی ئەنترناسیۆنال دا کە لە٢٠ی ژوئەنی ١٩٨٩ لە ستۆکهۆڵم پایتەختی وڵاتی سوئید بەسترا بەشداریی کردو بەداخەوە ماوەیەکی کورت دوای ئەو بەشداری کردنە دوکتور((قاسملو)) لە ڕێکەوتی ١٣ی ژوئیەی ١٩٨٩ی زائینی لە ڤییەن پایتەختی وڵاتی نوتریش(نەمسا) بە دەستی دیپلۆماتە تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی تیرۆر کرا.

مەبەست لە کوژرانی دوکتور "قاسملو" چ بوو؟ حکومەتی جمهوری ئیسلامیی ئێران هەستی بە ڕۆڵی کاریگەری دوکتور لە ڕێبەرایەتی کردنی حیزب‌و بزووتنەوەی حەقخوازانەی خەڵکی کوردستانی ئێران کرد بوو. بۆیە دەیانهەویست بۆ لەنێوبردنی "قاسملو" و کۆتایی هێنان بە تێکۆشان‌و چالاکییەکانی حیزبی دێمۆکرات‌و جووڵانەوەی میللی دێموکراتی گەلی کوردیش بێنن، کاتێك لە ڕێگای هێرش‌و پەلاماری نیزامی‌و بەندو داوی پولیسییەوە نەیانتوانی زەبری لێ بدەن. فێڵبازانە لە دەرگای "ئاشتیخوازی"یەوە بۆی هاتن، ئەوان دەیانزانی دوکتور قاسملوو چەندە لە خەبات بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ غەدرو بێعەدالەتی‌دا شێلگیرەو زۆر زیاتر لەوەش ئیمان‌و باوەڕی بە دیالۆگ‌و چارەسەریی ئاشتیخوازانەی مەسەلەی کورد هەیە. ئەوە بوو کە بە ناوی وتووێژی ئاشتیخوازانە لە پێناو چارەسەری مەسەلەی کورد لە ئێراندا، لە ڤییەن لە گەڵی دانیشتن‌و دوور لە یاساو عورفی مرۆڤایەتی، تیرۆریان کرد.[٨٤]

[84] کورتە مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. نووسینی د.عبدالرحمن قاسملوو، عبداللە حسن زادە چاپخانەی کومیسیونی چاپەمەنی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، چاپی٢ ٢٠٠٢ لاپەرە ٥١٩

## شەرەفکەندی، ژیان و تێکۆشان

دوکتور محەممەد سادق شەرەفکەندی لە نێو هاوڕێیانیدا بە دوکتور سەعید ناسراوە. شەهیدی نەمر دوکتور سەعید ساڵی ١٣١٦ی هەتاوی لە گوندی تەرەغەی ناوچەی بۆکان لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە پێشدا لە بۆکان و دوایە لە مەهاباد بوودو بۆ ساڵی ئاخری دەبیرستان چۆتە شاری تەورێز. ساڵی ١٣٣٨ لە "دانشسرای عالی"ی تاران لیسانسی شیمیی وەرگرتووەو لەو ساڵەوە هەتا ساڵی ١٣٤٤ لە شارەکانی ورمێ و مەهاباد دەبیری شیمی بووە. ساڵی ١٣٥١ بە بوورسی وەزارەتی علوم چۆتە فەرانسەو لە ماوەی چوار ساڵدا دوکتورای شیمی تەجزیەی لە زانستگەی ژمارە شەشی پاریس وەرگرتوە، ساڵی ١٣٥٥ گەڕاوەتەوە ئێران و وەك ئوستادیاری "شیمی تجزیە" لە زانستگەی "تربیت معلم"ی تاراندا دەستی بە کاری پیرۆزی مامۆستایەتی کردوە.

تێکۆشانی دوکتور "سادق شەرەفکەندی" لە حیزبی دێموکراتدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٣٥٢، ئەو کاتە کە لە پاریس خەریکی وەرگرتنی دوکتورا بوو، لەو ساڵەدا لەگەڵ رێبەری شەهیدی حیزب دوکتور قاسملووی مەزن لە پاریس ئاشنا دەبێ و بە ناسینی خەت و ڕێبازی سیاسیی حیزبی دێموکرات، داوای ئەندامەتی دەکا. پاش گەڕانەوە بۆ ئێران دەبێتە رابیتی دوکتور قاسملووی شەهید لە دەرەوەی وڵات و هێندێك تێکۆشەری لەمێژینەی حیزب لە نێوخۆی وڵاتدا.

لەبەر لێوەشاوەیی و زانایی و کارلێهاتوویی خۆی، کاك دوکتور سەعید زۆر زوو پلە تەشکیلاتییەکانی حیزبی بڕی. ساڵی ١٣٥٨ بوو بە موشاویری کومیتەی ناوەندی و هەر ئەو ساڵە لە کۆنگرەی چوارەمی حیزب دا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراو بەرپرسایەتیی کۆمیتەی حیزب لە تارانی پێ ئەسپێردرا. هاوینی ١٣٥٩ بۆ کاری تەواووەخت لەحیزبدا هاتەوە کوردستان و لە پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیدا بە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب هەڵبژێردراو، لەو ساڵەوە لە هەموو کۆنگرەکانی حیزبدا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و پاشان دەفتەری سیاسی هەڵبژێردرایەوە. لە ساڵی ١٣٦٥دا بوو بە جێگری

سکرتێرو هەتا شەهیدبوونی دوکتور قاسملووی ئەمر لەو مەسئوولییەتەدا خزمەتی بە حیزبو گەلەکەی کرد. لە پلینۆمی پاییزی سالی ١٣٦٨دا بە تێکڕای دەنگ لەلایەن کۆمیتەی ناوەندییەوە کرا بە سکرتێری گشتیی حیزبو پاش کۆنگرەی نۆهەمی حیزبیش دووبارە ئەو مەسئوولییەتەی پێ ئەسپێردرایەوە.

شەهید کاك "سەعید" ئینسانێکی زیرەك، زانا، ئازا، مدیرو بەوورەو بە ئیمانو تێکۆشەرێکی لێوەشاوەو بەوەج و ماندوویی نەناس بوو بەراستی جێنشینێکی هەلکەوتوو بۆ ڕێبەرێکی هەلکەوتووی لەدەست چوو بوو، بۆ ئەملاوئەولا یەکێك لەو ڕێبەرە سیاسیانە بوو کە گەلی کورد حەقی بوو شانازییان پێوە بکاو هیوایان پێ ببەستێ. بێگومان هەر ئەو تایبەتمەندی یانەش بوونە هۆی ئەوە کە کۆماری ئیسلامی رقی لێ هەلگرێو پیلانی لەنێو بردنی بۆ دابرێژێ کە بەداخی گرانەوە تێیدا سەرکەوتوو بوو.

گومان لەوە دا نیە کە لەدەست چوونی ڕێبەرێکی وەك دوکتور "سەعید" زیانێکی گەورەو زەبرێکی بەژانە کە وەبزووتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کوردو حیزبی دێموکراتی کوردستان دەکەوێ. بەلام دلنیاین کە هەر وەك پاش شەهیدبوونی دوکتور قاسملووی ئەمر ئالای دەستی ئەو تێکۆشەرە بەناوبانگە نەکەوتە زەوی‌و حیزبی دێموکرات بێ قاسملوویی پێوە دیار نەبوو. بە شەهیدبوونی دوکتور "سەعید"یش ئالای دەستی ئەو ئەمرە لە شەکانەوە ناکەوێو سەرەنجام دەگاتە لوتکەی سەرکەوتن.

## بیرەوەرییەك:

لە دوا نیوەڕۆی ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ۱۳۷۰/۱۰/۳۰ی هەتاوی بەرامبەر بە ۲۱ی دیسامبری ۱۹۹۱ی زایینی کۆنگرەی نۆهەمی حیزب لە گەڵی بەدرانی ناوچەی ناودەشتی کوردستانی عێراق دا بەسترا. کۆنگرە دروست لە ساڵڕۆژی لەدایکبوونی شەهید دوکتور قاسملووی نەمردا کە دەبووە شەوی یەلدا دەستی بەکار کرد. ئەو کۆنگرەیە یەکەمین کۆنگرەیە کە پاش نەمانی ڕێبەری شەهیدی حیزبمان دوکتور قاسملوو دەبەسترێ. بۆیە پێشنیار کرا بە "کۆنگرەی قاسملوو" بناسرێ. ئەو پێشنیارە بە تێکڕای دەنگ پەسند کرا. بە کۆنگرەی " قاسملوو " ناودێر کرا.

دەڵێن مرۆڤی گەورە و زانا بەر لە ڕووداو و خولقانی کارەسات و کردەوەی دڵتەزێن، وەك دڵ خەبەری پێ بدا وایە، باس لە قەومانی دەکا. ئەوە لە مورد شەهیدی نەمر دوکتور شەرەفکەندیدا وەڕاست گەڕا. دووهەمین ڕۆژی کۆنگرە بوو، جەلەسەی یەکەم

کۆتایی پێهات و ئانتراکت درا، بەشداران بەشی زۆریان چوونە دەرێ، ئەوانەی دیکەش هەر لە نێو هۆڵی کۆنگرەدا مابوونەوە. بەفرێکی زۆر باریبوو، هەوایەکی سارد و سەهۆڵبەندانی بوو.

ئەمن (لوقمان) لە گەڵ هاوڕێ خوشکە خەجیج مەعزورر لە بەر کوورەکە بووین. پێکەوە قسەمان دەکرد. لە ناکاو دوکتور شەرەفکەندی لە دوامان پەیدا بوو و گوتی ها شنۆیینە ئەوە باسی چ دەکەن؟ ئێمەش گوتمان باسی هەدیەی کۆنگرەکان دەکەین. دەڵێین هەر کۆنگرەیەی شتێکیان داوە بە بەشدارانی کۆنگرە، نموونە کۆنگرەی حەوت نارمی حیزب، کۆنگرەی هەشتەم ساکێك بوو. کۆنگرەی نۆهەم لە سەر کارتی نوێنەری کۆنگرە لە لای ڕاست وێنەی ڕێبەری شەهید دوکتور قاسملوویە لە لای چەپ وێنەی نوێنەرەکەیە لە نێوەڕاستدا نارمی حیزبە. دەبێ کۆنگرەی دەهەم چمان دەنێ؟ زۆر سەریع و بە پێکەنینەوە گوتی زۆر ئاساییە کۆنگرەی دەهەم لە جێی وێنەی نوێنەر وێنەی کاکی خۆتان لێ دەدەن. بە ڕاستی ئەمن تاسام و بێدەنگییەکی تەواو دایگرتم، بەڵام خوشکە خەجیج خێرا وەجواب هات و زۆر بە نارەحەتییەوە گوتی جا توخوا ئەوە قسەی پێشنیارە...؟ گوتی بۆ مەگەر ئەمن گیانم لە ئێوە زیاترە؟ ڕووی تێکردم و گوتی هەر ئەو ساڵ چەند جار تۆ لە مەرگ گەڕاوییەتەوە، ئەوە شتێکی سروشتی و ئاساییە وەقسە هاتم و گوتم بۆچوونەکەت ڕاستە، ئەوە ئەمرێکی سروشتییە لە بەردەم هەمووماندە بەڵام قسەکە ئەوەندە ناخۆش و تاڵە کە مرۆڤ بۆی هەزم نابێ. گوتی بۆ؟ ئەمنیش لە وەڵامدا گوتم لە حاڵێکدا هێشتا زامی بە ئێشی دوکتور قاسملوو لە سەر دڵی کورد بە گشتی و تێکۆشەرانی دێمۆکرات بە تایبەتی بە چاکی قەتماغەی نەبەستووە! کە بینی ئێمە زۆر بە قسەکە قەڵسین زەردە خەنەیەکی هاتێ و گوتی نە ئینشائەڵڵا هەمووومان زۆر دەژین، هەر قسە بوو بەسەر زارمدا هات و سوحبەتم لە گەڵ کردن. دەستی بە قسەی خۆش کرد و مەوزووعەکەی گۆڕی.

دوای سێ ساڵو بیستو یەك ڕۆژ لەو بیرەوەرییە تێدەپەڕێ. کۆنگرەی دەهەمە. بەرەو هۆڵی کۆنگرە دەچین. کاتێك پێم لە نێو ساڵۆنی کۆنگرە نا، هەیئەتی بەڕێوەبەری کۆنگرە، هەر نوێنەرەو ساکێکیان پێدا. ئەمنیش نۆرەم گەیشتێ و وەرم گرت. کە کردمەوە

دەفتەرو قەڵەمێکی تێدا بوو لە گەڵ کارتی نوێنەری کۆنگرە، کە کارتێکی ساکارو سادە بوو، کە سەرم هەڵێنا داخی گرانم چاوم بەتریبونی کۆنگرە کەوت سێ وێنەی لەسەر دانراوە لە نێوەڕاست پێشەوای دامەزرێنەر، یەکەم سەرۆك کۆماری کورد، لەلای راست دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملووی سەرکردەو مەزنە، لەلای چەپیشەوە شەرەفکەندی ژیرو ریبەرە. یەك لەحزە کەوتمەوە بیری کۆنگرەی نۆهەمو قسەکەی خۆی. ئەو چۆن پێشبینی کردو چۆنی هەڵسەنگاندبوو کە قسەکەی ئەوا وەڕاست گەڕا؟ بۆیە یەکەم رستەی کە لە دەفتەرەکەم نووسی‌ر دەستم پێ‌کرد ئەو بیرەوەرییە تاڵە بوو. لە کاتی نووسینی دێڕەکاندا دڵم بوو بە بورکان، بە خۆم نەوەستام چەند دڵۆپێك فرمێسك وەك ئەسپی سەرکەش لە کاڵانی چاوەکانم دەرپەڕین، وەك دڵۆپەی باران کەوتنە سەر لاپەڕەکانی دەفتەرەکەو ڕێگایان پێ نەدام چی دیکە قەڵەمم بڕ بکا. ئەوەندەم بۆ کرا تێر لە وێنەکانیان رابێنمو بێ‌دەنگ بێ ئەوە زمان گۆ بکا بیاندوێنم. بڵێم دڵنیا بن ئەو ناڵایە کە ئێوە بەرزتان کردۆتەوە، هەر شەکاوە دەبێ ناکەوێتە سەر زەوی و سەنگەری خەباتیش قەت لە تێکۆشەرانی دیموکرات چۆل نابێ. زوو یان درەنگ خەباتی رەوای گەلی کورد سەردەکەوێ. ئێوەش سەمبول و رەمزی خەباتمان دەبن. هەرگیز لە بیرمان ناچن. لەبەر چاومان قەت ون نابن.

## دیسان تاوان:

هاوینی ساڵی ١٩٩٢ دوکتور "شەرەفکەندی" سکرتێری گشتیی حیزب بۆ بە سەر کردنەوەی کاروباری حیزب لە دەرەوەی وڵاتو پێوەندی گرتن لە گەل کۆڕو کۆمەڵە، سیاسی یە نێرانی یە کان سەفەری ئەورووپای کرد. لە درێژەی مانەوەی لە ئەورووپا دا بۆ بەشداری لە کۆنگرەی نوزدەهەمی ئەنترناسیونالی سۆسیالیست دا بانگهێشتن کرا و لەو رۆژەکانی ١٥تا١٧ سیپتامبری ١٩٩٢ بە سەرپەرستیی وفدێك لە نۆزدەهەمین کۆنگرەی ئەم رێکخراوە

جیهانیە لە شاری بێرلینی ئاڵمان دا بەشداری کرد. دەڵێن مێژوو دوویات دەبێتەوە بەراستی ئەمە لە بارەی حیزبی دێموکراتو سەرکردەکانیەوە راست دەرچووە. دوکتور قاسملوو پاش بەشداربوون لە کۆنگرەی هەژدەهەمی ئەنترناسیۆناڵ دا ئێوارەیەکی پێنج شەممە کەوتە، بەردەسرێژی پیاو کوژانی کۆماری ئیسلامی و رۆژی هەینی هەواڵی تێرۆرەکەی بە حیزبو گەلەکەی گەیشت. لە بارەی دوکتور "شەرەفکەندی"یش عەینی شت بوو. ئەویش دوای تەواو بوونی کۆنگرەی ئەنترناسیۆنالو راست لە ئێوارەی دوای تەواو بوونی کۆنگرەکەدا و بە رێکەوت ئەو رۆژەش هەر پێنج شەممە بوو کە لە ناکاو کەوتە بەر دەسرێژی تێرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی و تێرۆر کرا،رۆژی دواتر کە رۆژی هەینی بوو هەواڵی تێرور کرانی بە هاوسەنگەرانی و خەڵکی کوردستانو جیهان دا بڵاو بووە. سەرەنجام رۆژی ١١ سێپتامبری ١٩٩٦ لە دوارۆژی کاری بیستەمین کۆنگرەی ئەنترناسیۆنال دا کە لە بنکەی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە نیۆیۆرك پێك هات حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران بە تێکرای دەنگ بە ئەندامی هەمیشەیی و بە پلەی چاوەدێری ئەم رێکخراوەیە وەرگیرا کەواتە پەیوەندیی دۆستانە و بەرهەمی تەمامی ئەم تێکۆشانە بە خۆینی دوو رێبەری لیوەشاوەیی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران ناودراوە.[85]

## شەرەفکەندی بۆ دیالۆگ نەك مەرگ

ژێرژیی کۆنە پەرستی کۆماری ئیسلامی بینی کە بەدوای تێرۆرکردنی دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملو سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکرات دا، جێگرەکەی دوکتور محەممەد سادق شەرەفکەندی (د. سەعید) جێی گرتەوە، لە ماوەیەکی کورتی زەمەنی دا توانی ئەو فەزا خەماوییەو پەشێوە کە روخساری گەلی کورد بە گشتیو تێکۆشەرانی ئەم حیزبە بە تایبەتی داگرتبوو بە حیکمەتی ژیرانەی خۆی برەوێنێتەوە، گوڕو تینێکی تازە بە حیزبەکەی ببەخشێ. تێکۆشا کە بە هیمەتو هاوکاری هاورێیانی کارێك بکا کەلێنی قاسملوو پڕکاتەوە،

[85] تیورسەدە تێکۆشان. نووسینی عبداللە حسن زادە چاپی ١٩٩٥ لاپەرە ٢٢٢

هەست نەکرێ کە حیزب بێ قاسملویی پێوە دیارە. ئەوەش گەورەترین پەیامی خۆراگری‌و بەربەرەکانی بوو کە شەرەفکەندی بە سەرانی کۆماری ئیسلامی دا. ئەوانی خستە دەریای سەرسوڕمانەوە. دیسان ڕێژیمی تیرۆریست پەروەری کۆماری ئیسلامی لە بەرامبەر ئیرادەو خۆراگری شەرەفکەندی‌و حیزبەکەی دا بە چۆك دا هاتن‌و بە پێی نەریتی دواکەوتوانەی خۆیان جارێکی دیکە کەوتنە تەون‌و بەستنی پیلانێکی دیکەی تیرۆری نێودەوڵەتی. ئەمجارەیان پیلانەکە لەژێر ناوی پرۆسەی دیالۆگی رەخنەگرانەوە هاتنە مەیدان‌و ئەوەیان بە شێوەیەکی بەرین بڵاو کردەوە کە حکوومەت ئامادەیە بوار بدا بە ئەحزابی سیاسی کە تێکۆشانیان هەبێ لە نێوخۆی وڵات دا بەڵام بە پێی ئوسولێکی دیاری کراو بە گوێرەی یاسای نیشتمانی، دوور بێ لە شەڕو خوێن ڕێژی‌و خەباتی توندوتیژ.

حیزبی دێموکرات هەستی بەو ڕاستی یە کردبوو. باشیش دەیزانی کە ئەو بۆچوونە درووست‌و مەنتقیی‌یە هەرگیز لە بیرو توانای سەرانی کۆماری ئیسلامی‌دا نیە. بەڵام ئەو لەلایەك بۆ چەواشەکردنی بیروڕای گشتیی جیهان‌و لەلایەکی دیکەوە بۆ تواندنەوەو لەنێوبردنی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی‌یە.

جێی لێوردبوونەوەیە کە هێندێك لە ڕێکخراوە سیاسییە ئێرانی‌یەکان لە دەرەوەی وڵات زۆر گەشبین بوون بەو رەوتەو ئاب‌و تابێکی تەواویان بەو پرۆسەیە دابوو. دیالۆگی رەخنەگرانە ببوە وێردی سەر زمان‌و سەردێری هێندێك لە ڕۆژنامەکان. جاری واش بوو باس لەوە دەکرا کە ئەوە حیزبی دێموکراتە ئامادە نیە دەست لە خەباتی توندوتیژ هەڵگرێ‌و لە ڕێگای دیالۆگی رەخنەگرانەوە، خەباتی سیاسیی خۆی درێژە بدا. بەڵام بێخەبەر لەوە کە مەبەستی سەرەکیی ڕێژیم لە دیالۆگی رەخنەگرانە لە داوخستنە. ئەگینا حیزبی دێموکرات دەتوانێ‌و رەسالەتی ئەوەی هەیە کە ئۆپۆزیسیۆنی پەرش‌و بڵاوی ئێرانی لەدەوری یەك کۆ بکاتەوە. بەرەیەکی لێ پێك بێنێ‌و بە پلاتفۆرمێکی ڕێکخراو بچنە پێش، ئەو کاتە ئۆپۆزیسیۆن سەرکەوتنی بەرچاو بەخۆوە دەبینێ. حیزبی دێموکرات کە هەمیشە هەوڵی داوە کێشەی کورد لە ڕێگای ئاشتیخوازانەوە چارەسەر بکاو لەو ڕێگایەشەوە نرخی زۆر گرانبەهای داوە

لەلایەك بۆ ئەوەی کە پێشی ئەو پروپاگەندەیە بگرێ کە ئەوە حیزبی دێموکرات نیـە کۆسـپی سەر ڕێگا لە لایەکی دیکەوە بۆ ئەوەی ئۆپۆزیسیۆنی ئێران ڕێـك بخـا ئـەوەی هەمیشـە بـە یەکێك لە کارو ئەرکەکانی خۆی داناوە. بۆیە کۆماری ئیسلامی کەوتە پەیوەندی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆن لەژێر ناوی ئەم پرۆسـەیەدا تـەعقیبی نیـەتی ناپـاکی خـۆی دەکردو خەریکی پیلك هێنانی ڕایەڵکەی سیخوری‌و دۆزینەوەی مـۆرەدا بـوو لـەو بارەشـەوە سەرکەوت. بۆیە باشترین کاتیش بـۆ بـەرێوەبردنی پیلانەکـە دوای تـەواو بـوونی کـۆنگرەی ئەنترناسیۆنال سۆسیالیستی هەڵبژارد. چونکە دەیانزانی کە شـەرەفکەندی دەچێتە کـۆنگرە دوای کۆنگرەوەهەلی لەبار بۆ چاو پێکەوتنەکان دەرەخسێ. کاتێـك لەلایـەن سـیخوریەك کـە تاکو ئێستا بە گوێرەی بەڵگەی یاسـایی ئەسـەلمێنراوە کێیـە. کۆمـاری ئیسـلامی ئاگـادار دەکرێتەوە کە دوای تەواوبوونی کۆنگرە کۆبوونەوەی ئۆپۆزیسیۆن لە ڕێسـتورانی میکۆنـوس دەبەسترێ‌و وەفدی حیزبی دێمـوکراتیش بـە سـەرۆکایەتی شەرەفکەندی بەشـدارە. سـەرانی کۆماری ئیسـلامی فەورەن دەست بەکار بوون‌و تیمێکی زەربەتی تیرۆریان ناردە ئاڵمان‌و لەگەڵ دەستەو پێوەندەکانیان بەرنامەی ئیعدامی شەرەفکەندی‌و هاوڕێیـان دادەرێژن پێش ئەوەی کە باسی چـۆنیەتی خوڵقـانی ڕووداوەکـە بکـەین‌و پێویسـتە دوو ڕەخنـە ناڕاسـتەی هێزەکـانی ئۆپۆزیسیۆن بە گشتی‌و وەفدی حیزبی دێموکرات بەتایبەتی بکەین.

ا/ ئەو کۆبوونەوە کە ڕێکخراوە تدابیری ئەمنییەتی لەبەرچاو نەگیراوە نەپۆلیسی ئاڵمان ئاگادار کراوە نە خۆیان کەسیان وەك پارێزەر یان کێشك داناوە. کە لەباری یاسایی یـەوە ناتوانی کەسی لـێ بەرپرسیار بکرێ.

ب/ شوێنی کۆبوونەوەکە زۆر نامونـاسیب بوو، چونکە شوێنێك بووە هەرچی ئێرانی بوو ڕووی تێ کردوە کەواتە شناسایی کردنی زۆر ئاسان بووە جیا لەوەش ئوسولی نهێنی کارو کاتی کۆبوونەوە بە شێوەیەکی ناڕێك لەبەرچاو گیراوە.

## بەرەو کۆبونەوەی ئۆپۆزسیۆن

کۆنگرە رۆژی سێ شەممە ١٥ی سپتامبەری ١٩٩٢ لە شاری بەرلین دەستی بە کار دەکاو ئێوارەی رۆژی پێنج شەممە ١٧ سپتامبەر کۆتایی بە کارەکانی دێنێ. بەشدارنی کۆنگرە بلاوە دەکەن، "شەرەفکەندی"و هاورێیەکانی بە مەبەستی بەشداریکردن لە کۆبوونەوەیەك لە گەڵ ئۆپوزیسیونی ئێرانی کە لەوەپێشتر قسەی لێ کرابوو، کاتی بۆ دیاری کرابوو، بەرەو رێستورانی میکۆنووس (شوێنی کۆبونەوە) وەرێ دەکەون. ساعەتی ٧/٥ی شەو دەگەنە میکۆنووس.

"بەشێك لە لایەنەکانی دیکەش نوێنەریان دێن. هێندیك لەوانەش کە پێشتر قەرار بوو بێن، لەبەر نەخۆشی یان لە بەر ئەوە، کە باش لە کاتی چاوپێکەوتنەکە ئاگادار نەبوون، بەشداری کۆبونەوە نابن."[٨٦]

"نوری" مەسەلەکە لە عەزیز دەپرسێو عەزیز دەڵێ: "مەگەر قەرار نەبوو دەعوەتەکە بۆ شەوی هەینی بێت؟" نوری دەسبەجێ دەست دەکا بە تەلەفون کردن، پاش ماوەیەك هێندێك کەس دێنو هێندێك کەسیش بەو دەلیلە کە ئەوان بۆ شەوی هەینی خۆیان ئامادە کردبوو و تازە دەرنگەو ناگەنێ، نایەن بۆ کۆبوونەوەکە. سەرجەم ٩ کەس بە چەشنی خوارەوە کۆ دەبنەوە.[٨٧]

١- دوکتور محەممەد سادق "شەرەفکەندی" سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران.

٢- فەتاح عبدلی، ئەندامی کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانو نوێنەری حیزب لە ئورروپا.

[86] کورتە مێژووی حیزبی دێموکرات، د. عبدالرحمن قاسملو، عبداللە حسن زادە، لاپەڕەی ٥٩٣

[87] سەفەری بێگەڕانەوە، سەلامی عەزیزی، چاپی ١٩٩٩، لاپەڕەی ٢٢

٣- هومایون ئەردەلان کادری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران‌و نوێنەری حیزب لە ئاڵمان.

٤- نوروڵلا محەممەدپوور "نوری دەهکوردی" دۆستی حیزب‌و سەر بە بزوتنەوەی چەپی سەربەخۆ.

٥- پەرویز دەستماڵچی سەر بە کۆماریخوازانی میللی.

٦- مەهدی "مجتبی" ابراهیمزادە ئیسفەهانی، ئەندامی شووورای ناوەندی سازمانی فیدائیانی خەڵکی ئێران (اکثریت).

٧- مەسعوود میراشد، کادری سازمانی فیدائیانی خەڵکی ئێران (ئەکسەریەت).

٨- عەزیز غەفاری، ئەندامی سازمانی فیدائیانی خەڵکی ئێران‌و خاوەنی ڕێستورانی میکۆنووس.

٩- ئیسفەندیار سادقزادە، دۆستی عەزیز غەفاری. ناوبراو بۆ ئەو کۆبوونەوەیە بانگهێشتن نەکرابوو. بەڵام ئەو شەوە هاتبووە میکۆنووس‌و یارمەتیی عەزیزی دەدا لە ئاشپەزخانەو پاشان لە سەر داوای عزیزی لە کۆبونەوەکەدا بەشداریی کردبوو. بەشداران سەرگەرمی باس‌و موناقشە بوون، لە ناکاو تێرۆریستەکانی چەك بە دەست هاتنە ژوورەوە، ئەوان لە ناست دیالۆگ زمانیان لاڵە، لە گەڵ ووشەی یاسا، قەڵەم‌و مەنتق نامۆن، شەرەفکەندی یەکەم ئامانجی پێکانە. بە مەرگی ئەو، دیالۆگ دەنگی برا.

## چۆنیەتیی کارەساتێکی دوور لە یاسا

دیالۆگ دەست پێ دەکرێ، تەوەری باسەکە مەسایلی جۆراوجۆری سیاسیی ئێران‌و کوردستان‌و هەروەها لێك نزیك بوونەوەو هاوکاریی ڕێکخراوە سیاسییەکانی ئۆپۆزیسیون دەبێ. ئێوەرۆکی وتووێژەکان لە سەر داخوازییە نەتەوەیی‌یەکان‌و دێموکراسی بۆ ئێران‌و، لە ڕاستی شێوەی سەقامگیرکردنی دێمۆکراسی لە ئێران ئەوەیە کە ئۆپۆزیسیۆن دەبێ چ یەکیەتیی‌و هاوکارییەکیان بە یەکەوە هەبێ کە بتوانێ ڕۆژێك یارمەتی بە سەقامگیری

دیموکراسی لە ئێران بکەن[88]. چەند خولەکێك بەر لە کاتژمێر ١١ی شەو، لە ناکاو دوو کەس چەك بە دەست کە دەم و چاوی خۆیان داپۆشیبوو، لە رستوورانەکە وەژوور دەکەون و راستەوخۆ دەچن بۆ ژووری کۆبوونەوەکە. یەکێك لە دوو نەفەرەکان بە زمانی فارسی جنێو دەدا بە بەشداران (مادر قحبەها) و کۆبونەوەکە هاوکات دەدەرێتە بەر دەسرێژ. لە ئاکامی تەقەکەدا وەفدی نوێنەرایەتیی حیزب شەلاڵی خوێن دەبن، هەر کام لە راست خۆیەوە دەکەونە سەر زەوی و دوو کەس لە بەشدارانیش برینداردەبن و ئەوانی دیکە لە بن مێزو کورسییەکاندا خۆیان مەلاس دەدەن.

تێرۆریستەکان بۆ دڵنیابوون لە ئەنجامدانی مەئمورییەتەکەیان بە دەمانچە تیری خەلاس لە سەری کاك دوکتور شەرەفکەندی و هاوڕێیەکانی دەدەن و پاشان لە رێستوورانەکە را دەکەن. بێجگە لەو دوو کەسە لە کاتی بەڕێوەبردنی کردەوە تیرۆریستییەکەدا کەسێکی دیکەش لە بەر دەرگای رێستوورانەکە کێشك دەبێ و چاوەدێری رستووران و دەورووبەری دەکا. تیرۆریستەکان رادەکەن و لە شوێنی کارساتەکە دوور دەکەونەوە، بە داخەوە شەرەفکەندی و هاوڕێیانی دەستبەجێ گیانیان لە دەست دەدەن و نووری دێهکوردی و عەزیزی غەفاریش بریندار دەبن.

[88] هێشتا لە برلین تازی هەن، وەرگێرانی سایل شەرەفی، زنجیرە بەنامەیەکی رادیۆفەردا بە بۆنەی سیزدەهەمین ساڵرۆژی شەهادەتی د.شەرەفکەندی و هاوڕێیانی

# کرۆکی شوێنی جینایەت لە ڕێستووڕانی میکونووس

KICHEN

BAR

PERSONALTLACH

WC/F

WC/M

دەرگای چوونە ژوورەوە

١٢ ١١

١ ٢ ٣ ٤

٥ ٦ ٧ ٨

٩

١٠

١- دوکتور شەرفکەندی، ٢- نووری دەهکوردی، ٣- مەهدی ابراهیم‌زادە، ٤- اسفندیار صادق‌زادە،
٥- همایون اردلان، ٦- فتاح عبدلی، ٧- پرویز دستمالچی، ٨- محمود میرراشد، ٩- عزیز غفاری،
١٠- شوێنی وەستانی ئەو تیرۆریستەی کە بە موسەلسەلی یوزی ئامادەبووانی وەبەر دەسڕێژ دا،
١١- گارسۆنی ڕێستووڕانەکە، ١٢- ئەو مشتەرییەی کە لە کاتی تیرۆرەکە لەوێ بوو

**بەندی دووهەم:**

## چارەسەری کێشەکە لە روانگەی یاسای نێوخۆی ئاڵمان

دەزگای قەزایی ئاڵمان، بە گوێرەی یاسای نێوخۆی دەسەلاتێکی سەربەخۆ و بە ئەزموون و سەلاحیەتدارو خاوەن رابردوویەکی درێژە، یاسای نێوخۆیش دەسەلاتو سەلاحیەتی خۆی لە دەستوری ئەو ولاتە وەرگرتووە، بۆیە توانای تێروانینی لەو کێشەو دەعوایانە هەیە کە لە چوارچێوەی ئەو هەرێمەدا روو دەدەن. جا چ هاوولاتی بن و یان بیانی بن. بە کورتی هەڵوێستی یاسای نێوخۆی ئاڵمان لەو کورتە خاڵانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ.

١ـ بە گوێرەی قاعیدو بەڵگەکانو پێڕاگەیشتنی تاوانو جینایەت ئەرکی دادگای ئەو ولاتەیە کە تاوانەکەی تێدا روو داوەو دەعوایەکیش کە بۆ ئەم دادگایە بەرز کراوەتەوە، تێروانینی لێ بکا.

٢ـ دەستدرێژی کراوەتە سەر حاکمیەتو سەربەخۆیی سیاسیو قەزایی ئەو ولاتە. کەواتە مافی خۆیەتی کە تێروانین لە کێشە کە بکا.

٣ـ قەزایی ئاڵمان مافی موحاکمەکردنی ئەو تاونبارانەی هەیە. چونکە ئەو تاوانبارانە لە خاکی ئاڵماندا جینایەتیان ئەنجام داوە.

٤ـ دەوڵەتی ئاڵمان دەتوانێ هەموو ئەو کەسانە کە بە گوێرەی حوکمی یاسای نێوخۆی بە گومان لێکراو ناسراون تەعقیب بکا.

٥ـ لە رێگای پۆلیسی نێونەتەوەییەوە یان لە هەر رێگەیەکەوە کە ئیمکانی هەبێ بیانگرێ.

٦ـ دوای بەرێوەچوونی توێژینەوە سەرەتاییەکان لە لایەن پۆلیسی بێرلینەوە بایەخی مەسەلەکە زیاتر لەوەوە خۆ دەنوێنێ ئەویش، ئەوەیە کە کوژراوەکان میوانی بەرلین و حیزبی سۆسیال دیمۆکراتی ئاڵمان بوونو هەروەها گومان لەوەیە کە لەوانەیە دەوڵەتێك لە

پشت ئەم کوشتارانەوە بێ، بۆیە لێکۆڵینەوەی زیاتر خرایە ئەستۆی پۆلیسی ئاڵمان‌و کۆمیسیۆنێك بە ناوی میکۆنوس بە ٨٩ ئەندامەوە کرایە بەرپرسی راپۆرتی ئەم رووداوە لە حاڵێکدا هێشتا کۆماری ئیسلامی بە سوێند خواردن دەست تێدا بوونی خۆی رەد دەکردەوە.[٨٩]

## پرس‌و لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان:

خێرا لە لایەن یەکێك لە مشتەرییەکانی رێستورانەوە هەواڵ بە پۆلیس دەدرێ. دوای بەرێوە بردنی عەمەلیاتەکە تیرۆریستەکان لە رێستوران دەردەکەون‌و بە پەلە بە ماشینێکی .B.M.W کە پێشتر بۆ مەبەستی دەربازکردنی تیرۆریستەکان لە سەر شەقامی بەر دەرکی رێستووران راگیرابوو، رادەکەن.

دوای چەند خولەکێك پولێس دەگاتە شوێنی رووداوەکە. لە پێشدا بریندارەکان رەوانەی نەخۆشخانە دەکا. لە رێگادا نوری دهکردی بە هۆی سەختی برینەکەی گیانی لە دەست دەدا. عەزیزیش دوای چارەسەری پزشکی دەگەرێتەوە دۆخی ئاسای خۆێ. پاشان پۆلیس زۆر بەوردی سەیری شوێنەکە دەکا شوشەو پەنجەرەکان شکاون، مێزو کورسی یەکان لێکدراون، دیمەنەکە شێوێندراوە قوربانیەکان لە مەودای نیزیکی یەکتر کەوتوون. پووکە فیشەکی زۆر لە نێو رێستورانەکە دەبیندرێن. پریشکی خوێن لێرەو لەوێ بەرچاو دەکەون کومەڵێك پرسیاری دەگەنە مێشك. پولێس پرسیارەکان دەست پێ دەکا لەو کەسانەی کە بەشداری کۆبونەوە بوونە یان لە کاتی روداوکە لەوێ بوون لەو دیمەنانە پرسیارو ناسەوارانەی کە بە جێ ماون کۆمەڵێك شتی نادیار بۆ پۆلیس روون بوونەوە. کە قەرێنەی

---

[89] هێشتا لە برلین قازی هەن ، وەرگێرانی حلیل شەرەفی ؛ زنجیرە بەنامەیەکی رادیۆفەردا بە بۆنەی سێزدەهەمین ساڵرۆژی تیرۆری د.شەرەفکەندی و هاورێیانی

بە هێزو بەسوود بوون بۆ یارمەتیدانی لە دۆزینەوەی بنەمایەکانی رووداوەکەو دەستگیر کردنی تاوانبارەکان دا بە چەشنی خوارەوە.

١ـ تیرۆریستەکان قیافەی رۆژهەلاتی "شرقی"یان هەبووە.

٢ـ دوو تیرۆریست هاتوونە ژووری کۆبونەوەکە یەکیان "مسلسل"و یەکیان دەمانچەی پێ بووە.

٣ـ یەکێك لە تیرۆریستەکان کە "مسلسل"ی پێ بووە پیش تەقەو رەگبارکردن بە زمانی فارسی جنێوی بە بەشدارانی کۆبونەوەکە داوە (مادر قحبەها).

٤ـ پۆلیس لە سەر ئەساسی قسەی شاهیدانی عەینی رووداوەکە دوو وێنەی خەیالی لە تاوانباران کێشاوەو بلاوی کردەوە. داوای لە خەلك کرد بۆ ناسین و گرتنی تیرۆریستەکان، یارمەتی پۆلیس بدەن.

٥ـ پۆلیس مەبلەغی پەنجا هەزار مارکی وەك جایزە دیاری کرد بۆ ئەو کەسانەی کە زانیاریی بەکەلك لە سەر تیرۆریستەکان بدەن بە پۆلیس... .[90]

لە باری قەزاییەوە ئەو قەرینانەی سەرەوە نیشاندەری یەك راستین کە ئەویش ئەوەیە کە ئەم جینایەتە لە پێش دا گەلالەی بۆ داڕێژاوە و دەستێکی دەرکی بە هێزی لە پشتە. بۆیە دەزگای قەزایی ئالمان دانانی لیژنەیەکی تایبەتی بۆ لێکۆلینەوە لە دۆزی میکزنوس بە پێویست زانی. بۆیە رۆژی ١٨ی سیپتامبەری ١٩٩٢ ئەم لیژنەیە لە ژمارەیەك کارناسانی مەسایەلی جینایی و ئەفسەرانی کارامەی ئیدارەی هەوال گری ئالمان بە سەرۆکایەتی داواکاری گشتیی "دادستانی گشتیی"و ئیدارەی هەوال گیری بەرلین کارەکانی خۆی دەست پێ کرد.

[90] سەفەری بێگەرانەوە، نووسینی سەلامی عەزیزی، چاپی ١٩٩٩، لاپەرەی ٤٥، ٤٦

## لیژنەی لیکۆڵینەوە لە دۆزی میکۆنووس

لە ئاکامی هەوڵی ژیرانەو لیکۆڵینەوەی بەردەوام، پۆلیس توانیی لە ٣ کیلۆمیتری ریستورانی میکۆنووس رۆژی ٢٢ی سپتامبر جانتایەکی وەرزشی بدۆزیتەوە کە ئەو کەل و پەلانەی خوارەوەی تیدا بوون.

١- "کلاویکی رەشی چندراو لە گەل شالگەردنیکی خەت داری قاوەیی و دەسکیشیکی چەرمی."

٢- یەك قەبزە "مسلسل"ی دەستی مۆدیل یوزی، کالیبر٩ میلیمیتری بە دەنگ برەوە"صدا خفە کن".

٣- یەك قەبزە دەمانچەی لاما مودیلی ایکس، ای، کالیبر٧/٦٥ میلیمیتری بە دەنگ برەو،

٤- پاش ماوەیەکی کەم، ماشینیB.M.W کەش دۆزرایەوە. ماشینەکە مۆدیلی ٧و ژمارەکەشی B-AR5503 بوو. لیکۆڵینەوەکانی پۆلیس سەلماندی کە هەموو ئەو شتانە کەرەسەی بەریوبردنی تاوانی میکۆنووس بوون[91].

لە بارەی قەزاییەوە کلاوەکەو شالەکە بۆ ئەوە بووە کە سەرو دەوچاویان پیداپۆشری و دەسکیشەکەش بۆ ئەوە بووە کە شوینی قامکیان لەسەر پەلاپیتکەی چەکەکان دیار نەکەوی، یوزی دەنگبریش بۆ ئەوەیە کە بکەر (قاتل) بتوانی بە راحەتی کارەکە ئەنجام بدا، دەمانچەکەش بۆ لیدانی تیری خەلاس لە قوربانییەکان، ماشینەکەش بۆ پیدەربازبوونی تیرۆریستەکانە. بەم جۆرە بەو ئاکامە دەگەین کە ئەو قەتلە بە پیی بەرنامەیەکی داریژراو بووە کە دەستی تیرۆریزمی نیودەولەتیی تیدایە، بۆیە پیویستە هۆکارەکانی ئەنجامدانی ئەو قەتلانە بدۆزریتەوەو بریاردەرانی سەرەکی بناسرین.

[91] سەفەری بیگەرانەوە، نووسینی سەلامی عەزیزی، چاپی ١٩٩٩، لاپەرەی ٤٧

لیژنە لە کارەکانیدا سەرکەوتوو بوو، رۆژ لەگەڵ رۆژ زانیاریی بەکەڵکترو گرینگتری لە سەر تیرۆریستەکان وەدەست دێناو لە ناکامدا رۆژی ٤ی ئوکتوبر، لە یەکێك لە شارەکانی رۆژئاوای ئاڵمان بە ناوی "راینە" دوو کەس لە لایەن پۆلیسەوە دەگیرێن.

١ـ یوسف ئەمین، ٢٤ ساڵە، خەڵکی لوبنان.

٢- عەباس راحل، ٢٥ ساڵە خەڵکی لوبنان، ناسراو بە "عماد عماش"، ئەو دوو کەسە هەرکامیان نزیکەی ١٥ هەزار مارك‌و پاسپۆرتێکی جەعلی "تەزویر"یان پێ دەبێ‌و خەریکی راکردنن بۆ دەرەوەی ئاڵمان. لە حوکمی دەستبەسەرکردنی ئەو دوو کەسەدا هاتووە کە ئەوانە "تۆمەت بارن" بە بەشداریکردن لە تیرۆری میکۆنووس‌و کوشتنی چوار کەس و بریندارکردنی ئەفەرێکی دیکە، پۆلیس پاشان رای‌گەیاند کە شوێنی بەری دەستی "عباس راحل" لەگەڵ شوێنەواری بەجێ‌ماو لەسەر دەمانچەی لاما کە لە جانتای وەرزشیدا لە نزیك میکۆنووس دۆزراوەتەوە، یەك دەگرێتەوە. یوسف ئەمین رۆژی ٧ی ئوکتوبر لە بەندیخانەدا دانی بە تاوانەکانیدا نا. دوای ئێعترافی ناوبراو، رۆژی ٩ی ئوکتوبر پۆلیس ٣ کەسی دیکەی لە بێرلین دەسگیر کرد.

١ـ کاظم دارابی کازورنی خەڵکی ئێران.

٢- محەممەد عطریس خەڵکی لوبنان.

٣- عطاالله ایاد خەڵکی لوبنان.

لە حوکمی دەستبەسەرکردنی ئەو سێ کەسەدا ئاماژە کراوە، کە کازم دارابی بە تاوانی بەشداریکردن لە تیرۆری میکۆنووس‌و پیلان دارشتن بۆ ئەو جینایەتە، ٢ کەسەکەی دیکەش بە تاوانی ئاگاداری لە سەر پیلانی میکۆنووس‌و دابینکردن‌و ئاسانکاری بۆ دەربازبوونی تاوانبارانی ئەو رووداوە، دەگیرێن. بە گرتنی ئەو کەسانە قسەکانی یوسف ئەمین بە تایبەتی سەرپۆش لە سەر تاوانی میکۆنووس لادراو، بوار بەربلاوتر بووە کە پولیس بە دەستی پرو پشت ئەستور بەو بەلگانەی کە کەوتوونەتە دەست، لێکۆڵینەوەی

خۆی درێژە بدا. دەرکەوت ئەو پیلانە تیرۆریستی‌یە زیاتر لەو ٥ کەسەی کە لە لایەن پۆلیسەوە گیراون بەشدار بوون، بەڵام هێندێك لە تاوانباران توانیویانە خۆیان دەرباز بکەن، یان دەرباز بکرێن.

## زانیارییەکانی بریتانیاو قەرینەکان بەڵگەی بەهێزن بۆ پۆلیسی ئاڵمان

لە هەواڵەکانی راگەیەنە گشتی‌یەکانی جیهانی بە دوای گیرانی تیرۆریستەکاندا دەرکەوت کە "ام، ای، ٦" دەزگای "زانیاریی دەرەکی" ئینگلیس کە بە "اینتلیجنت" سرویس بەناوبانگە، زانیاریی وردی لە سەر تیرۆیستەکان داوە بە پۆلیسی ئاڵمان کە بۆتە هۆی گیرانیان.

مەسەلەکە دەگەرێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە شاری بێرلین لە ژێر کونترۆلی چوار دەوڵەتی هاوپەیماندا بوو: ئەمریکا، ئینگلس، فەرانسەو یەکیەتیی سۆڤیەتی پێشوو. هەرکام لەو دەوڵەتانە کاروباری خەڵکی ژێر دەسەڵاتی خۆیان کونترۆل دەکرد، بەو جۆرە "کاظم دارابی" لە ژێر چاودێریی "ام، ای، ٦"دا بووەو تەلەفونەکەشی کۆنترۆڵ کراوە.

"چونکە (ام،ای،٦) کاظم دارابی بە ئەندامی رەسمیی سوپای پاسدارانی شۆرشی ئێران زانیوە کە خەریکی کاری جاسوسی‌و پێکهێنانی شەبەکەی تیرۆریستی‌یە"[92].

پاش رووخانی دیواری بەرلین‌و یەکگرتنەوەی دوو بەشی ئاڵمان‌و، کۆتایی‌هاتنی داگیرکردنی بێرلین "ام، ای، ٦" پێش ئەوەی کە بێرلین بەجێ بێڵن، تەواوی زانیاری‌و بەڵگەیەك کە لە سەر تێکۆشانی تروریستیی کاظم دارابی‌و هاوکارەکانی هەیبوو، دەیدا بە پۆلیسی ئاڵمان. ١) بەشێك لەو بەڵگانە بریتی بوون لە دەیان کاسێتی وتوێژی تەلەفوونیی "کاظم‌دارابی"و بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی کە بریتی بوون لە:

أ) کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی لە تاران.

[92] سەفەری بێگەرانەوە، نووسینی سەلامی عەزیزی، چاپی ١٩٩٩، لاپەرە ٤٩

ب) کاربەدەستانی سەفارەتی ئێران لە بۆن.

ج) کاربەدەستانی کونسوولگەریی ئێران لە بێرلین.

"ام، ای، ٦" تەنانەت دوای بەجێ هێشتنی بێرلینیش پۆلیسی ئاڵمان ئاگادار کردۆتەوە کە کۆماری ئیسلامیی ئێران پیلانێکی بۆ کوشتنی ڕێبەرایەتیی کورد بە دەستەوەیە کە بەرنامەی ئەو پیلانە بەناوی ڕەمزی "بزرگ علوی" لە سەفارەتی ئێران لە بۆن داڕێژراوە"[93].

٢) لە ڕەوتی دادگای میکۆنووسدا روون بۆوەو سەلمێندرا کە ئاغای مووسەویان نە تەنیا لە تیرۆری میکۆنووس، بەڵکوو لە تیرۆرەکانی ئورووپادا رۆڵێکی بنەڕەتی گێڕاوە. ئاغای مووسەویان ئامادە نەبوو لەو پێوندییەدا لەگەڵ رادیۆ فەردا قسە بکا، لەو کاتەدا بڵاوبوونەوەی وتارێك لە رۆژنامەی "فوکوس" پەردەی لە سەر دەست تێدابوونی کۆماری ئیسلامی لە رووداوەکەدا هەڵ دایەوە کە قۆناخێکی نوێ لە لێکۆڵینەوەکانی بە دواوە بوو.[94]

٣) داواکاریی وەزیری ئەمنییەتی کۆماری ئیسلامی لە دەوڵەتی ئاڵمان بۆ پێشگیری لە بەرێوەچوونی دادگا ئەم پرسیارەی دروست کرد کە ئەگەر دەوڵەتی کۆماری ئیسلامیی ئێران دەستی لە تیرۆری ڕێبەرانی کورددا نەبووە، بۆچی خوازیاری بەرێوەنەچوونی ئەو دادگایەیەو ئامادەیە ئیمتیازگەلێك بدا.[95]

٤) کاظم دارابی جیا لە دوو پارێزەری دیاریکراو (تەسخیری) پارێزەرێکی دیکەشی هەبوو. پرسیار ئەمەیە کە خەرجی ئەو پارێزەرە گران قیمەتانە کێ دەیدا؟! ئەمانە

---

[93] سەفەری پێگەرانەوە، نووسینی سەلامی عەزیزی، چاپی ١٩٩٩، لاپەرەی ٤٩، روزنامە کیهان شمارە ٥٩ پنجشنبە اول فوریە ١٩٩٦ صفحە ١٢

[94] هێشتا لە برلین قازی هەن ، وەرگێرانی سمایل شەرەفی ، ژنەوە بەنامەیەکی رادیۆفەردا بە بۆنەی سێزدەهەمین ساڵرۆژی تیرۆری د.شەرەفکەندی و هاوڕێیانی

[95] هەمان سەرچاوە

کۆمەڵە قەرینەیەکی پرسیار خولقێنن کە لێوردبوونەوەیان یارمەتی دەدا بە بەشی قەزایی بۆ بەدەستهێنانی سەرداوێك لە قەزییەکە."[96]

## ئیقرارو ئیعتراف بە تاوان دەکرێ

بەرێز سیمونز simonez کە ئەفسەرێکی گەورەی پۆلیسی ئالمانی فیدراڵو ئەندامی ئەو لیژنەیە کە لێکۆڵینەوە لە دۆزی میکۆنووس دەکا، کرا بە سەرپەرشتی لێپرسینەوەو ناسین. پاش گیرانی "یوسف ئەمین" لە رۆژی ٤ی مانگی ئوکتوبردا ئاوبراو بوو بە بەرپرسی لێکۆڵینەوە لە یوسف ئەمین لە رۆژی ٧ی ئوکتوبر یوسف ئەمین لە بەندیخانەدا داوای چاوپێکەوتنی سیمونزی کرد. لەو دیدارەدا یوسف ئەمین دانی بە تاوانەکەدا هێناو ئیقرارو ئیعترافی تەواوی لە سەر دۆزەکە کرد. هەرچی لە جانتایدا بوو هەڵیرشت بەرنامەو پیلانی تیرۆرەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە وردی باس کرد. پوختەی دانپیانانی یوسف ئەمینی لە کتێبی "سەفەری بێ گەڕانەوە"دا لە نووسینی سەلام عەزیزی چاپی ساڵی ١٩٩٩ لە لاپەڕە ٥١ تا ٥٦ بە درێژی باس کراوە. ئەوەی لێرەدا گرینگە ئەوەیە کە دانپیانانی یوسف ئەمینی دەورێکی کاریگەری هەبوو لە سەر روونبوونەوەی پیلانی تیرۆری میکۆنووس کە سیمونز دواتر وەك گەواهیدەر بانگ کرا بۆ دادگاو ئیقرارو ئیعترافی یوسف ئەمینی بە وردی گێڕایەوە. لە بەردەم قازیو بە دوای ئەو بەڵگەو زانیاریانەدا دەزگای قەزایی ئالمان حوکمی گرتنی "جلب" ئەو گومانلێکراوانەی خوارەوەشی دەر کرد.

١ـ شەریف ناسراو بە "ابو رمان" تا ئێستا نەگیراوە، ئێرانییە، ناوبراو لەگەڵ "عەباس راحل" چوونە نێو رستورانەکەو تیرۆرەکەیان ئەنجام داوە. موسەلسەلی "مسلسل"ی پێ بووەو پێش تەقەکردن بە فارسی جنێوی "مادر قحبەها"ی داوە.

[96] هەمان سەرچاوە

٢- فضل الله حەیدەر لوبنانی‌یەو شوفێری ماشێنەB.M.W کە بووە، بە گوێرەی زانیارییەکانی پۆلیس، ناوبراو حەوتوویەك دوای تیرۆرەکە لە رێگای فرۆکەخانەی شونفلدی SHONFLD لە بێرلین چۆتەوە لوبنانو لەوێڕا چۆتە ئێران.

٣- محەمەد ئێرانی‌یەو ئەو کەسەیە کە لە گەڵ "فضل الله حیدر" لە نێو ماشێنی B.M.Wدا لە شەقامی رێستورانەکە، چاوەڕوانی تیرۆریستەکانیان کردوە، تا ئێستا نەگیراوە.

## بەندی سێهەم:

## دابینکردنی عەدالەت یان پاراستنی بەرژەوەندییەکان

بەبڕوای جیهانی‌و ئەوگرانی مافو عەدالەت بەگشتی‌و خەڵکی زوڵم لێکراوی کوردستانو گەلی کورد بە تایبەتی، ترسو دڵەڕاوکێیان بوو کە جینایەتی بێرلین وەك کارەساتی ڤییەنو پاریسو سویسرا... پشت گوێ بخرێ، یاساو دادپەروەری‌و مافی مرۆڤ فیدای قازانجو بەرژەوەندیی ئابووری‌و سات‌وسەودای سیاسیی دەوڵەتەکان بێ. بەڵام دەزگای قەزایی ئاڵمان ئەرکی نیشتمانی‌و یاسایی خۆی بەو پەڕی ئازایەتی‌یەوە بەجێ هێناو لە هیچ کۆسپو هەڕەشەیەك نەسڵەمییەوە، لێپرسینو لێکۆڵینەوە رەوتی ئاسایی‌و ئوسوولیی خۆی بە مەسیری حەقو دادپەروەری‌دا برد کە لە ئەنجامدا پێنج (٥) کەس لە تاوانبارەکانی بەشدار لە کردەوەی میکۆنووس‌دا گیرانو بەند کران. لێرەدا داواکاری گشتیی ئاڵمان ئاغای "الکساندرفون اشتال" رۆڵێکی بوێرانەی گێڕاو بەکردەوە سەربەخۆیی دەزگای ئاڵمانی بە بیروڕای گشتیی پیشان دا.

دادستان لە ئیدیعانامەی خۆی‌دا کە رێکەوتی ١٧ی مانگی مای ساڵی ١٩٩٣، دەری کرد، بە راشکاوی رایگەیاند کە کاظم دارابی ئەندامی رەسمیی ئاسایشی (واواك)و سوپای پاسدارانی ئێرانەو بەرنامەی تیرۆری "میکۆنووس" راستەوخۆ لە لایەن کۆماری

ئیسلامیی ئێرانەوە دارێژاوە. سیاسەتی رەسمیی دەوڵەتی ئاڵمان لەگەڵ بیروبۆچوونی دەزگای قەزایی جیاوازی هەیە" دەوڵەت خوازیاری دادبینیی تیرۆریستە بەندکراوەکان بوو بە بێ ئەوەی دۆسیەی تیرۆرەکە بە سەرانی ئێران پێوەند بدرێتەوە. هۆی سەرەکیی هەڵوێستی رەسمیی دەوڵەتی ئاڵمان دوو مەسەلەیە:

١- قازانجی ئابووری.

٢- ترس لە مەسەلەی بۆمب دانانەوە، بارمتەگرتن لە لایەن کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە.

<u>رۆژنامەی ئاڵمان فرانگفورتێر ئالگیمانیە تسایتونگ:</u>

"رێکەوتی ١٦ی مارسی ١٩٩٦ لە زەمانی سەرۆکی بنیاتی بازرگانیی ئاڵمان ـ ئێران، ئاغای ریدل (RIADEL) نووسیویەتی کە مەحکومکرانی ئێران لە مەسەلەی میکۆنووس دا شوێنی ئالەبار لە سەر ئابووریی ئاڵمان دادەنێ. بە گوێرەی تەخمینی وەزارەتی ئابووریی ئاڵمان ١٥٠٠٠ جێگای کارکردن بۆ کرێکارانی ئاڵمانی بەستراوەتەوە بە سەوداکردن لە گەڵ ئێران".[97]

شایەدی دانی ئاغای گرۆنێوراڵ کە لە بەردەم داوەرانی مەحکەمەدا خۆی لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان بوارد، واقعییەتێکی سەلماند کە بۆ شارەزایانی بواری قەزایی جێی سەرنج و تێڕوانینێکی گرینگ بوو لە نیسباتی قەزیەکە. بۆیە دەقی قسەکانی وەك خۆی دەنووسینەوە. ئاغای گرۆنێوراڵ کاتێك کە رۆیشت هەرچی پرسیاریان لێکرد گوتی زۆر بەداخم ناتوانم وەڵام بدەمەوە، بەهۆی ئەوەی وەزارەتی نێوخۆ مۆڵەتی وەڵامدانەوەی بە من نەداوە، ئەمانە نهێنیی حکومەتن. ئەوکات سیاسەتی ئاڵمان ئەوە بوو تۆمەتبارەکان بگرن و کردەوەکە مەحکووم بکەن. بەڵام ناوێك لە کۆماری ئیسلامی نەهێنن. بێدەنگیی ئاغای واڵ کە لە باری سیاسییەوە نەیدەتوانی زانیارییە نهێنییەکانی

[97] سەفەری بێگەرانەوە، نووسینی سەلامی عەزیزی، چاپی ١٩٩٩، لاپەڕەی ٦٦

ولاتەکەی "دەولەتی ئالمان" بدا بە دادگا، زۆری نەخایاندو ماوەیەك دواتر لە نامەیەکدا بۆ دادگای نووسی (یەکێك لە ولاتانی دۆستی ئالمان منی بانگهێشتی ناوەندی زانیارییەکانی خۆی کردوە، پەروەندەیەکی تایبەت بە کوشتارەکانی میکۆنوسی کۆ کردۆتەوەو بۆ خوێندنەوە داویە بە من، کاتێك کە ئاغای گرۆنێروالْ دوای خوێندنەوەی ئەم بەلگانەی ولاتەکەی دۆستی ئالمان بۆی دەردەکەوێ کە ئەو زانیارییانە بە تەواوەتی لەگەلْ ئەو بەلگانەی کە لە دەستی دەولەتی ئالماندا بوون ریکدەچن، نەچارەیان چوونکە زانیارییەکانی ولاتی خۆی وەدەست نەهێنابوو، بەربەستێکی یاسایی نەبوو بۆ ئەوەی مۆلەتی پێ نەدا ئەو زانیارییانە بدا بە دادوەرانی دادگا)، ئاغای گرۆنێروالْ لەو بەلگەیەدا نووسی: "بە پێی ئەو ئاگادارییانە کە ئێمە هەمانە، تیرۆری میکۆنوس کاری دەولەتی کۆماری ئیسلامیێ وەزارەتی ئیتلاعاتو ئەمنییەتی ئێرانەو، سێ حەوتوو پێش تیرۆرەکە تیمێك لە ئێرانەوە هاتووە شوێنو رێگای تیرۆرەکەی تاوتوێ کردوەو بۆ جێبەجێ‌کردنی تیرۆرەکە تیمێکی زەربەتی لە ئێرانەوە هاتوە ئەو کارەی کردوەو لە شەوی رووداوەکەدا سیخوری فەلاحیانیش لە رێستووران بووە، واتە ئەو راپۆرتە ئەوەندە وردو دەقیقە کە رەد ناکرێتەوە.[98]

سێ حەوتوو پێش دەسپێکردنی دادگا، عەلی فەلاحیان لەگەلْ تاقمێکی دیکە راستەوخۆ هاتنە ئالمان بۆ ئەوەی ئیمتیاز بدەن. "ئیسمیت باوئێر" کە لە کاتی دەولەتی "هیلمۆتکۆل" وەزیری رێکخستنی رێکخراوە ئەمنییەتییەکان بوو دانی بەوەدا نا کە عەلی فەلاحیان لە سەفەری ئۆکتۆبری ۱۹۹۳ی خۆیدا بۆ ئالمان داوای لێ کردوە کە پێش بەرێوەچوونی دادگا بگرێ، لە بەرامبەردا کۆماری ئیسلامی ئامادە بوو ژمارەیەك لە بارمتەکانی ئیسرائیلی کە لە دەستی حیزبوللادا دیل بوون ئازاد بکا. ئەوە لە دۆخێك

[98] هێشتا لە برلین قازی هەن ، وەرگێرانی حەلیل شەرەفی ، زنجیرە بەنامەیەکی رادیۆفەردا بە بۆنەی سێزدەهەمین سالرۆژی تیرۆری ٤٤ و ٤٥

دا بوو کە زۆر جار کۆماری ئیسلامی وتوویژی لەگەڵ ئیسرائیل بە خەتی سووری ئیزامی ئیسلامی ناو بردبوو، بەڵام دەوڵەتی ئاڵمان لە وەڵامدا وتیان کار لە دەستیان چۆتە دەرێو کەوتۆتە دەست دەزگای دادوەریو ئێمە ناتوانین هیچ گوشارێکیان بخەینە سەر.[99]

بۆیە دەزگای قەزایی لەسەر کارەکانی بەردەوام و شێلگیرو بە بێ گوێدان بە قازانجو بەرژەوەندییە سیاسیو ئابوورییەکانی دەوڵەت، کارەکانی ئەنجام دەدا، بۆیە لە نێوان دادستانو ئاغای "اشمیت باور" وەزیری موشاویری "صدراعظم" لە کاروباری ئەمنیەتیدا لە سەر دۆسییەی میکۆنووس ناکۆکی دروست بوو. بەبڕوای گشتیی خەڵکی ئاڵمانو دەزگای راگەیەنە گشتییەکان لایەنگری ئەزەرو هەڵویستی دادستان بوونو پەیتا پەیتا ئەسنادو بەڵگەی میکۆنووسیان بڵاو دەکردەوە کە رۆڵی سەرەکیو دەست تێوەردانی راستەوخۆی کۆماری ئیسلامیی ئێرانی لە کردەوەکەدا زیاتر دەخستە ڕوو. بە نووسراوی داواکاری، دادستان دۆسییە تەکمیلو ئامادەی ناردن "احاله" بۆ دادگای جینایی بێرلین بوو.

99 هەمان سەرچاوە ل ٢٩ و ٣٠

# پەیامی دەفتەری سیاسیی
# حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

دوای ئەوەی لە لایەن دەزگای قەزایی ئاڵمان بڵاو کراوە کە تیرۆریستەکانی ڕوداوی میکۆنوس ڕۆژی ۲۸ی ئوکتوبری ۱۹۹۳ لە دادگای جینایی بێرلین دادبینی دەکرێن ،دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ڕۆژی ۱۸/۱۰/۱۹۹۳ پەیامێکی نارد بۆ ڕێکخراوی ئەنترناسیونالی سوسیالیستو کۆمەڵەی ئابوری ئەوروپا. لە بەر گرینگی نێوەرۆکی پەیامەکە، دەقی پەیامی دەفتەری سیاسی وەك خۆی دێنین.

بەرێز ئاغای پیەرمورا سەرۆکی ئەنترناسیونالی سوسیالیست!

بەرێزان وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی ئەندامی کۆمەڵەی ئابووریی ئورووپا.

کۆرو کۆمەڵو شەخسییەتە ئینسان دۆستەکان!

وەك ئاگادارن ڕۆژی ۲۸ی ئوکتۆبری ۱۹۹۳ موحاکمەی تیرۆریستێکی ئێرانی و چوار تیرۆریستی لوبنانی بە تۆمەتی کوشتنی دوکتور "محەممەد سادق شەرەفکەندی" سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و سێ کەس لە یاوەرانی لە ئاڵمان دەست پێ دەکرێ. هەر لە ئێستاوە هەوڵ و تەقەلایەکی ئاشکرا بۆ بەلاڕێدا بردنی جەرەیانی دادگاو ڕزگارکردنی تاوانباری ئەسڵیی ئەو کردەوە تیرۆریستی‌یە دەستی پێ کردوە. گیرانی ئاغای "باخمن" بازرگانی ئاڵمانی لە ئێرانو سەردانی گومانایی "علی فەلاحیان"، وەزیری ئیتلاعاتی کۆماری ئیسلامی بۆ ئاڵمان، دەبێ لە چوارچێوەی ئەو هەوڵو تەقەلایانەدا سەیر بکرێ.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستی‌یە کە نە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانو نە دوکتور شەرەفکەندیو قوربانییانی دیکەی تیرۆری ۱۷ی سێپتامبری ۱۹۹۲ی بێرلین، هیچ چەشنە

ناکۆکییەکیان لەگەڵ هیچ حیزب و ڕێکخراو و دەستەو تاقمێکی لوبنانی نەبوە، ئاشکرایە نەخشەی تیرۆری ڕێبەرانی حیزبی دێموکرات لە لایەن کاربەدەستانی ئێرانەوە کێشراوە و بە هاوکاریی ڕاستەوخۆی دیپلۆماتە تیرۆریستەکانی ئەو ڕێژیمە لە ئاڵمان پیادە کراوە.

بە تێگەیشتنی ئەو واقعییەتەش کە خەباتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بۆ وەدەستهێنانی مافە ئینسانییەکانی خەڵکی کوردستانی ئێران ڕووی لە تەواوەتی دەسەڵاتداریتی کۆماری ئیسلامییە، هەر چەشنە هەوڵدانێك بۆ تاوانبارکردنی قوڵێك یان تەنیا کەسانێك لە حاکمییەت، هەوڵدان بۆ بە لاڕێدابردنی مەسەلەکە لە ڕێبازی واقیعیی خۆیەتی.

بۆیە بە ناوی حەق و عەدالەت و ئینسانییەتەوە داواتان لێ دەکەین خزمەت بە دێموکراسی و مافی مروڤ نفوزو ئیعتیباری خۆتان لە لای دەوڵەتی ئاڵمان بە کار بێنین بۆ ئەوەی ڕێگا بدا دادگای تاوانبارانی کارەساتی بێرلین، ڕەوتی ئاسایی و قەزایی خۆی ببڕێ بۆ ئەوەی تاوانبارانی واقیعیی کە هیچ کەس جگە لە کۆماری ئیسلامیی ئێران لە تەواوەتی خۆی دا نیە سزای خۆی لە دادگای ویژدانی مرۆڤایەتی دا وەربگرێ و بە دنیا و بە بیروڕای گشتیی جیهانی بناسێندرێ. تکایە ئەو پەڕی ڕێزو حورمەتمان وەربگرن.[100]

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

دەفتەری سیاسی

۱۹۹۳/۱۰/۱۸

---

[100] ڕۆژنامەی "کوردستان" ئۆرگانی کومیتەی ناوەندیی ح.د.ك.ئ، ژمارە ۲۳۱ لاپەڕە ۲۶

## میکۆنووس بۆ میژوو

بەجێیە کە ئاماژە بەوە بکەین کە بۆ چی دادگای جینایی ئاڵمان لە لێکۆڵینەوە دادبینی بکوژانی قەتلی شەرەفکەندی و یارانی بە دادگای میکۆنوس ناوبرد. ناوێک کە کەوتە سەر لاپەرەکانی مێژوو وەک نورمبێرگ و توکیو... خۆ دەنوێنی.

١)- میکۆنووس، گوایە پێشتر رێستورانێکی یونانی بووە و دوایە بۆتە هی عزیز غفاری یەکێك لە ئەندامی کۆنی رێکخراوی چریکە فیدایی یەکانی گەلی ئێران و لە راستی دا بۆتە مەکوی ئێرانی‌یەکان.

٢)- دوکتور شەرەفکەندی و هاورێ یەکانی لەو رێستورانەدا تیرۆر کراون.

٣)-دادگای لێ پرسینەوەو پێ راگەیشتن بە کردەوەی تاوانبارانەی بێرلین بە دادگای میکۆنووس ناوی دەرکرد.

٤)-میکۆنووس گۆرەپانی ململانێ شەرێکی گرینگی نێوان کۆماری ئیسلامی و بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردستانی ئێران بوو. لە بواری نیزامی دا کۆماری ئیسلامی توانی دەست لەو بزوتنەوەیە بوەشێنێ و زیانی گەورەی پێ بگەیەنێ، بەڵام لە بارەی سیاسی و تەبلیغی و دیپلۆماسی‌یەوە لە ئاستی بیروڕای گشتی‌دا هەرەسی هێناوە و تەنیا دۆڕاوی و شەرمەزاریی پێ برا.[101]

[101] ١ـ د.عبدالرحمن قاسملو، عبداللە حسن زادە ، کورتە مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستان، لاپەرە ٥٩٢ ٢ـ سەلامی عەزیزی، سەفەری بێگەڕانەوە لاپەرە ١١

# بەشی پێنجەم

## "هەلوێستی ئالمان"

### بەندی یەکەم:

- دادگای جینایی ئالمان "میکۆنووس"
- لە بەرلین قازی سەربەستە،یاساوسەرۆوەرە
- چۆنیەتی بڕیاردان
- حوکمی جەلب "گرتن"
- هەلوێستی حکوومەتی ئالمان

### بەندی دووهەم:

- دوو بۆچوونی دژ بە یەك
- لە یاسا دا راستی یەکان دەردەکەون
- حوکمێکی مێژوویی "لە قەزا دا بێوێنەیە"
- پارلمانی ئالمان

## بەشی پێنجەم

## "هەڵوێستی ئاڵمان"

### بەندی یەکەم:

### دادگای جینایی ئاڵمان (میکۆنوس)

پاش ١٣ مانگو چەند رۆژ لێکۆڵینەوەی بەردەوامو تەکمیل کردنی دۆسیەی میکۆنووسو لە دوای سەرنەکەوتنی هەوڵەکانی کۆماری ئیسلامی بۆ پێشگیری کردن لە پێکهێنانی دادگاو دادبینی کردنی تاوانباران، لە ئاکام دا رۆژی ٥شەممە، ٢٨ی مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٩٣ی زایینی، دادگای "میکۆنووس" لە هۆڵی مورافعاتی دادگای جینایی بێرلین بە شێوەی رەسمیو عەلەنی دەستی بەکار کرد.

گرینگیو بایەخی دادگای میکۆنووس لەوەدایە کە ئەوە یەکەمین جارە تێرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی کە لە دەرەوەی ئێران کردەوەی تێرۆریستی یان بۆ چەندەمین جار ئەنجام داوە، لە دادگایەکی ئاوا باوەرپێکراو دا دادبینی دەکرێن.

لە هۆڵی مورافعات دا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکو هەواڵنێرو رۆژنامەنووس لە هەموو دانیشتنەکان دا بەشدار بوون. جەرەیانی رۆژی دەست پێکرانی دادبینی بە شێوەی راستەوخۆ لە تەلەویزیۆنی ئاڵمان بڵاو کراوە. پێکهاتەی دۆسیەی میکۆنووس چەند بەشێک لە خۆ دەگرێ کە لێرەدا ئاماژە بە چەند خاڵێك دەکەین کە کاکڵەی دۆسیەکەن.

دۆسیەی میکۆنووس ٣ کەس خاوەن سکاڵای هەبوو (شاکی تایبەتی) کە بریتین لەو کەسانە:

١ـ رەسووڵ قادری برای دوکتور سادق شەرەفکەندی

٢ـ کەژاڵ عەبدولی خێزانی فەتاح عەبدولی

٣ـ شۆهرە بەدیعی خێزانی نووری دێهکوردی

*تێبینی: لە کەس وکاری هومایون ئەردەلان کەس سکاڵای نەکردوە (دەعوای بەرز نەکردۆتەوە)! هەرکام لەو ٣ کەسە، پارێزەرێکیان هەیە بەو ناوانەی خوارەوە:*

١ـ ئۆتۆ شیلی (Otto Schily) پارێزەری رەسووڵ قادری،

٢ـ هانز ئیریگ ( Hons Ehrig ) پارێزەری کەژاڵ عەبدولی،

٣ـ ڤۆلفانگ ویلەند ( Wolfgang Wieland ) پارێزەری شۆهرە بەدیعی.

تاوانبارە گیراوەکانی قەزییەی میکۆنووس بریتین لە:

١ـ کازم دارابی کازروونی (ئێرانی)، ناوبراو سێ پارێزەری ئیختیاری هەیە بەم چەشنە:

الف: سیسلی کیهن ـ زمێسکات ( Cisela Kihn-Zmeschkot ).

ب: دێتلەر کالێج ( Detler Kolloge ).

ج: ڤۆلف ـ گانگ پانکە ( Wolf-gong Panka ).

٢ـ عەباس راحل (لوبنانی)، ناوبراو ٢ پارێزەری "تسخیری" هەیە:

الف: هێربێرت هێردیچ (Herbert Herdich ).

ب: میشێل کایزر (Michael Kaiser).

٣ـ یووسف ئەمین (لوبنانی)، ناوبراو ٢ پارێزەری "تسخیری" هەیە:

الف: دوکتور بۆنگارتز (Dr. Bungartz).

ب: دوکتور تامس بۆمێیر ( Dr. Thomas Baumeyer).

٤ـ عەتائوڵلا ئەیاد (لوبنانی)، ناوبراو ٢ پارێزەری "تسخیری" هەیە:

الف: ئاندرێکا وردینجر ( Anderca Wurdinger).

ب: هێنینگ سەپانجێنبری (Henning Sapangenbery).

٥ـ محەمەد عەتریس (لوبنانی)، ناوبراو ٢ پارێزەری "تسخیری" هەیە:

الف: ئۆلسۆلام ( Ulosalm).

ب: ئاسترید ئادۆم (Astrid Adom).

**ئەندامانی دەستەی دادگا:**

دەستەی سەرۆکایەتیی دادگا لەو کەسانەی خوارەوە پێك هاتبوو:

١ـ سەرۆکی دادگا

٢ـ چوار قازی

٣ـ دادستان، (داواکاری گشتی)

ئەو کەسانەش لەنێو هۆڵی مورافعات دا دەبیندران:

الف: ژمارەیەك فەرمانبەری ئیداری

ب: دوو دیلمانجی (مترجم) عەرەبی

ج: دوو دیلمانجی فارسی

د: یەك دوکتورو ژمارەیەکی زۆر پۆلیس حازر بوون.

سەرۆکی دادگا بە ناوی کوپچ (Kupsch) لە پێش دا دەستی کرد بە ناساندنی داواکارە تایبەتی یەکانو تاوانبارەکانو پارێزەرەکانیان. دواتر باسی چۆنیەتیی کاری دادگاو پاراستنی نەزمو نیزامی نێوخۆو ئەرکی هەواڵنێرو رۆژنامەنووسو جەماوەری کرد. سەرۆکی دادگا لە درێژەی قسەکانی دا گوتی: هێندێك کەسی دیکەش کە ئیحتمالی هەیە لە رووداوی میکۆنووس دا (مشارکت) بەشداری یان کردبێ ئێستا نەگیراون. ئەمڕۆ کارە رەسمیو تەشریفاتی یەکانی دادگا کۆتایی هاتو کات بەرەو تەواو بوونە. ﴿دەزگای﴾ قەزایی ئاڵمان لەژێر تەوژمی دوو لایەن دایە: لە لایەك وەزارەتی دەرەوەی ئاڵمان، لە لایەکیتر سەرانی حکوومەتی تاران بۆ ئەوەی دەزگای قەزاییو قازی رازی بکەن سبەینێ ٢٩ی ئۆکتۆبری ١٩٩٣ لە کاتی خوێندنەوەی حوکمەکە دا راستی یەکان وەك خۆی نەدرکێنێ.[١٠٢]

[102] ١ـ سەلامی عەزیزی، سەفەری بێگەڕانەوە، لاپەرەی ٧٣، ٧٤ ٢ـ رۆژنامەی لیبراسیون ١١ ئاوریلی ١٩٩٧

## لە بەرلین قازی سەربەستەو یاسا سەرومرە

پۆلیس مەسئوولانەو ژیرانە شوێنی تیرۆریستەکانی هەلگرتو پاش هەولێکی زۆر توانی تەواوی رایەڵکەی سیخوریی ئەو تۆرە تیرۆریستی یەی میکۆنوس بدۆزێتەوە[103]. پۆلیس زۆر کەسی گرتو لە زۆر کەس پرسیاری کرد. تا سەرەنجام لە نێوان ئەوان دا ئێرانی یەكو چوار لوبنانی بە تاوانبار ناسێنو دانی بە دادگا. دادوەرەکان مرۆڤگەلێکی شەریف و مرۆڤدۆست، دادپەروەر و وردبین بوون، بە تایبەت سەرۆکی دادگا ناوبانگی بە گەورەترین و دادپەروەرترین دادوەری دادگاکانی ئاڵمان دەرکردبوو. بەرەو پێشچوونی کارەکانی دادگا بە تایبەت قسەکانی "ابوالقاسم مصباحی" و "بنی صدر" وەك شاهیدی دان لە بەردەم سەرۆکی دادگا و ئیعترافی تۆمەتباران و بەڵگە و زانیاری یەکانی ئیسباتی قەزیەکە رۆژبەرۆژ لە ئیگەرانی یەکانی کۆماری ئیسلامی و زیاد دەکرد و لە ئاکامدا بوو بە هۆی ئەوە کە ئاخوندەکانی دەوڵەتی لە قووم فتوای کوشتنی دادستان و دادوەرەکانی دادگایان دەربکەن.[104] بەڵام سەرەڕای ئەوە کە ئەم دوو دادستانەی کە لێکۆڵینەوەکانیان بەرەو پێشەوە برد لە لایەن کۆماری ئیسلامی یەوە هەڕەشەی ئەوەیان لێ کرابوو کە تووشی چارەنووسی سەلمان روشدی دەبن.

بەڵام دەزگای قەزایی ئاڵمان بێ ئەوەی تەماع بیانگرێ یان هەڕەشە بیان ترسێنێ، ئەیشاردەوە کە پیلانی تیرۆری دوکتور "سادق شەرەفکەندی"و هاوڕێیانی لە لایەن کاربەدەستانی هەرەبەرزی کۆماری ئیسلامی یەوە نەخشەی بۆ کێشراوەو دەستووری جێبەجێ کردنی دراوە.

---

[103] د. هوشنگ شامبیاتی ،حقوق جزای عمومی، جلد اول چاپ هشتم تهران ۱۳۷۲ لاپەرەی ۳۹۲ ، ۳۹٦

[104] هێشتا لە برلین قازی هەن ، وەرگێڕانی حایل شەرەفی ، ژمارە بەنامەیەکی رادیۆفەردا بە بۆنەی سێزدەهەمین ساڵڕۆژی تیرۆری ل ٤٣

## چۆنیەتیی دانی بڕیارەکە:

سەرەتا کارەکان لە ڕێگای "فەلاحیان" وەزیری ئیتلاعاتەوە بەڕێوە بران. ناوبراو سەرچاوەی زانیاریی و رایەڵکەی سیخوڕی خۆی لە ئاڵمان وەکار خست. کاتی پێکهاتنی کۆنگرەی ئەنتەرناسیۆنالیی سوسیالیست نزیك بۆوە، ئەوان دەیانتوانی بەرنامەڕێژی بکەن. لەسەرەتای دەیەی ۱۹۸۰وە ڕێبەرانی حیزب لە کۆنگرەی ئەنتەرناسیۆنال دا بەشدار دەبوون. هەربۆیە روون بوو کە دوکتور "شەرەفکەندی" دێتە بێرلین. هەڵسەنگاندنەکە وابوو کە ئەگەر ئەو تیرۆرە لە ئاڵمان دا بەڕێوە بچێ، پێوەندیی نزیکی ئێران و ئاڵمان دەبێتە هۆی ئەوە کە قەزییەکە بێدەنگی لێ بکرێ.

لە ئێران دا ئەوە ڕێبەریی مەزهەبی نیە (کە لەو بارەوەبەتەنیا) بڕیار دەدا. بەڵکوو مەرجەعێکی دەوڵەت لەو پێوەندی یە دا بڕیاری بە دەستە "کۆمیتەی کاروباری تایبەتی" کە لە ڕێبەری مەزهەبی، سەرۆك کۆمار، وەزیری ئیتلاعات، وەزیری سوپا و وەزیری دەرەوە پێك هاتووە ئەو بڕیارانە دەدا.

پاش ئەوەی فەلاحیان لە لایەن کۆمیتەی کاروباری تایبەتی یەوە پێی ڕاگەیەنرا کە بڕیاری کوشتنی ڕێبەرانی حیزبی دێموکرات پەسند کراوە، ئەم کۆمیتەیە ڕاست "فەلاحیان"ی کردە مەئمووری بەڕێوەبردنی کارەکە. ئەم تیرۆرە ناوی ڕەمزی "فریاد بزرگ علوی" لەسەر دانرا. لە کۆتایی ژوونیە دا "ارشد و کمال"ی (دوو مەئمووری ئیتلاعاتیی ڕژیم) هاتنە ئاڵمان. ئەوان لەژێر پەردەی کاروباری بازرگانی دا هاتبوون، بەلام بۆ ئەو مەبەستە نەهاتبوون، بەڵکوو بۆناسانکاری و ئامادە کردنی بواری تیرۆرەکە هاتبوونە ئێرە تا ڕاپۆرتی وەزعەکە بدەنەوە بە فەلاحیان. ئەوان لێرە کەسێکی خۆیان هەبوو کە "دارابی" بوو. دارابی لە ساڵی ۱۹۸۰وە لە ئاڵمان دەژیا. بە گوێرەی زانیاری یەکانی

ڕێکخراوی ئەمنییەتیی ئالمان، ناوبراو ئەندامی سوپای پاسداران و دەزگای ئەمنییەتیی ئێران و حیزبوڵلای لوبنانە. ئەوە مەسەلەیەکی گرنگ بوو. بوودجەی حیزبوڵلای لوبنان لە لایەن ئێرانەوە دابین دەکرا و هەر لە لایەن ئێرانیشەوە تەعلیم دەدرا. دەوڵەتی ئێران وەك ئامرازێك بۆ مەبەستەکانی خۆی لەوان کەڵك وەدەگرێ.

"دارابی" کە مەئموورییەتی بەڕێوەبردنی کارەکەی پێ ئەسپێردرابوو، تاقمێکی بۆ مەبەستەکەی پێك هێنا. (ئەمین و راحل...) . ئەمین و راحل لە ئێران دا ئامووزشی نیزامی یان دیتبوو. ئەوان ساڵی ١٩٨٩ داوایان لە ئالمان کرد بە پەنابەر وەریان بگرێ، ئەوان بە هۆی مزگەوتێك کە دارابی ئەخشێکی گرنگی لە بەڕێوەبردنی دا هەبوو لەگەڵ ناوبراو دا ئاشنا بوون.

"ئەمین" و "راحل" لە ٣٠ی ئووتی ١٩٩٢ دا سەفەرێکی هاوبەش بۆ "یوتنبرگ" دەکەن. ئەو سەفەرە کە بۆ ڕێزگرتن لە بیرەوەریی "موسی صدر" بووە، گرنگییەکی زۆری هەبوو. چونکە جگە لە "ایاد"، "عطریس"و "ئەمینی"یش ئاگادار بوون. هەر لەو سەفەرە دابوو کە ئەوان لەگەڵ "کمالی"و "ارشد" کە بۆ ئامادەکردنی مەسەلەکە هاتبوون، ئاشنا بوون. هەر لەو سەفەرەش دا ئەوان بە هەواڵی پێکهێنانی کۆبوونەوەی ئۆپوزیسیۆن لە ڕێستورانی میکۆنووسیان زانی.

"کازم دارابی" لە ٢٥ی ئووت دا تەلەفونێکی مۆبایلی کڕی. مەبەستی لە کڕینی ئەو تەلەفونە دەیتوانی بە خێرایی پێوەندی بگرێ بێ ئەوەی هیچ کەسێك بتوانێ کۆنترۆلی بکا. لە دەورووبەری ٧ی سێپتامبری ١٩٩٢ دا تاقمێکی کۆماندۆ بە سەرۆکایەتیی شەریف، (عەبدولڕەحمان بن هاشمی) هاتە بێرلین. ناوبراو لەباری خەباتی چریکی یەوە ئینسانێکی کارامە بوو. ئەو لەگەڵ دارابی پێوەندیی گرت. هاتنی شەریف هیچی لە ئەخشی دارابی کەم ئەکردەوە. کاروباری لۆجستیکیی بەرنامەکە هەروا لە ئەستۆی دارابی بوو و ئەو دەیتوانی بەرنامەکە بە باشی بەڕێوە ببا.

دارابی ماڵەکەی خۆی لە ئیختیاری تیمی تیرۆر دانابوو (راحل لەو ماڵە دا دەژیا کە دوایە ئەوانی دیکە هاتن. دارابی لە ۱۱ی سێپتامبر دا کلیلی ماڵە دزستیکی خۆی بە ناوی "برغجیان" وەرگرت. ئەو ماڵە لە مەجموعەیەکی ئاپارتومانی دابوو کە بۆ ماڵی تیمی زۆر موناسیب بوو. مەعلووم نەبوو کە دارابی چۆن زانیویەتی ئەو ماڵە بەتاڵە).

دوای ئەوە رۆژی ۱۲ی سیپتامبری ۱۹۹۲ لە ماڵی دارابی، ئەمینو شەریفو حەیدەر چاویان بە یەك کەو. دارابی رای‌گەیاند کە ماڵێکی دیکەی بۆ تیرۆر ئامادە کردووەو دەبێ ئەو ماڵە بەجێ بێڵن. بریار درا هیچ ئاسەوارێك لە خۆیان لەو ماڵە دا نەهێڵنەوەو هەموو شتێك پاك بکەنەوە. چونکە دارابی دەیزانی دوای ئەنجام دانی تیرۆر مومکینە ماڵەکەی لە لایەن پۆلیسەوە بپشکێندرێ. شەریف بە دارابی دەڵێ: بۆ ئەو ماڵە تەلەفون نەکا، ئەگەر کارێك پێویست بوو بۆخۆی تەلەفون دەکا. ئەو شەوە دارابی دەچێتە هامبورگو لە هۆتێل وەتاغێك دەگرێ بۆ ئەوەی وا نیشان بدا کە لە کاتی تیرۆرەکە دا لە بێرلین نەبووە.

"دوکتور شەرەفکەند لەگەڵ دۆستەکانی، رۆژی ۱۷ی سیپتامبریان بۆ چاوپێکەوتنی ئۆپوزیسیۆنی ئێرانی لە رێستورانی میکۆنووس دا دیاری کرد. بۆیە نووری داوای لە غەفاری کرد کە دۆستەکانی دەعوەت بکاو ناوی ۱۰ تا ۱۵ کەسی دا بە ناوبراو. غەفاری خەلکەکەی بۆ رۆژی ۱۸ دەعوەت کردو ئەوە هەڵە بوو.

کاتێك رۆژی ۱۷ دوکتور شەرەفکەندی، هەڤاڵان عەبدولیو ئەردەلانو نووری دێهکوردی، هاتنە رێستوران، دیتیان کەس لەوێ نیە. بەناچار بەهۆی غەفاریو "اسفندیار" تەلەفون کرا بۆ کەسانی بانگێشت کراو. هێندێك لەو کەسانە بە دەلیلی نەخۆشی یان کار نەیانتوانی بەشداری بکەن.

بەرێوە چوونی عەمەلیات

لەو ماوەیە دا شەریف، راحلو ئەمین بەردەوام لە هاتوچۆ دابوون تا سەرەتاکانی کارەکەیان رێك بخەن. لە ۱۳ی سێپتامبر دا حەیدەر ماشینێکی B.M.Wی دەستی

دووهەمی کرێ. بەرنامەکە ئاوا دانرابوو کە دوو کەسیان تەقە بکەن، یەکیان بە مۆسەلسەڵو ئەوی دیکەیان بە حەوت تیر (گوللەی کۆتایی هێنان بە ژیان).

وادانرا کە یەکێك لەو دوو کەسە ئەمین بێ. بەڵام کاتێك ئەو پێشنیارەی پێکرا، ناوبراو رەدی کردەوەو بنەماڵەی خۆی کردە بیانوو. شەریف ویستی ئەو بڕیارەی پێبگۆڕێ، بەڵام سوودی نەبوو. وا دانرا کە لەبەر دەرکی ڕێستووران بێ. راحل تەقەکردن بە حەوت تیرو شەریف تەقەکردن بە مۆسەلسەلی پێ سپێردرا. لەو پێوەندییە دا بڕیار درا کە دەست بەجێ دوای عەمەلیات تیمکانی ڕاکردن بۆ راحل پێك بێ، هەربۆیە عطریس دەبوایە گوزەرنامەی براکەی بدزێ.

لە ١٦ی سێپتامبر ئەمین و راحل ماڵەکەیان بە مەبەستی هێنانی چەك بەجێ هێشت و چەند سەعات دواتر بە حەوت تیرو مۆسەلسەلو دەنگ کپ کەر (صدا خفەکن)ەوە گەڕانەوە. ئەو چەکانە هی ئەرتەشی ئێران بوون. راحلو حەیدەر بە وردی ڕوانیانە چەکەکان و ساکێکی وەرزشیان بۆ ئامادە کرد. لەو مەودایە دا لە لایەن خائینێکەوە بە تیمی تێرۆر ڕاگەیەنرا کە کۆبوونەوەکە ڕۆژی ١٧ی سێپتامبر پێك دێ.

تیمی تێرۆر ڕۆژی ١٧ بۆ تاقیکردنەوە سەردانی شوێنی تێرۆرەکەیان کرد. ١٧ی سێپتامبری ١٩٩٢ دوکتور سادق و هاوڕێیانی لە رێستوران کۆ بوونەوە. سەعات ٩ی شەو تەلەفوونی ئەو ماڵەی کە تیمی تێرۆری لێ بوو زەنگی لێدا. ئەوە نیشانەیەك بوو لە لایەن ئەفەری خەیانەتکارەوە بۆ تیمی تێرۆر بۆ دەستپێکردنی عەمەلیات.

تیمی تێرۆر بەرەو شوێنی تێرۆر وەڕێ کەوتن. ئەمین و راحل بە تاکسی و مێترۆ ڕۆیشتن و لە نزیك شوێنی تێرۆر پیادە بوون. حەیدەرو محەممەد لە ماشێن دا چاوەڕێ مانەوە. لەو کاتە دا ڕێستورانەکە بێجگە لە دوکتور "شەرەفکەندی" و هاوڕێیەکانی، مشتەری دیکەشی لێ بوو.

سەعات ۱۰/۵۰ شەریف و ڕاحل لە ڕێستووران وەژوور کەوتن. ئەوان سەبارەت بە قوربانی یەکان زانیاری تەواویان هەبوو. بۆیە زۆر بە خێرایی تەوژەکەیان ئەنجام دا بێ ئەوەی لەو بارەوە تووشی هەڵەیەك بن.[105]

## حوکمی گرتن ( جەلب )

ئەم واقعییەتە ڕۆژی ۲٤ی مارسی ۱۹۹٦ی زایینی بە دەرکردنی حوکمی گرتنی (جلب) "عەلی فەلاحیان" وەزیری ئاسایش و ئەمنییەتی ئێران لە لایەن قازی دادگای عالی ئاڵمان بە ناوی دوکتور "ولست Dr. Wolst" سەلێندرا.[106] لەبەر گرینگی و بایەخی ئەو کێشەیە لێرەدا پوختەی نێوەرۆکی چەند خاڵێکی سەرەکی حوکمەکە باس دەکەین و لە جوزئیاتی خۆ دەبوێرین:

گومان لێکراو: عەلی ئەکبەر فەلاحیان،

شوێنی لەدایکبوون: *شاری نەجەف ئاباد ـ ئێران،*

ساڵی لەدایکبوون: *۱۹٤۹ ی زایینی،*

پیشە: *وەزیری ئاسایش (واواك)ی کۆماری ئیسلامیی ئێران.*

تاوان: ***بەشداری لە داڕشتنی پیلان و کوشتنی ٤ کەس و هەوڵدان بۆ کوشتنی کەسێکی دیکە لە ڕووداوی میکۆنوس دا.***

"بەڵگە و دەلیلی زۆر بە دەستەوەیە کە ناوبراو لە ڕێکەوتی ۱۷ی سێپتامبری ۱۹۹۲ دا لە شاری بێرلینی ئاڵمان بە هاوبەشی و هاودەستی ئەفرادی دیکە و بە نیەت و هەدەفێکی پەستی نامرۆڤانە و بە ئامرازی ترسناك چوار ئینسانی کوشتوە و ئیقدامی بۆ کوشتنی نەفەرێکی دیکەش کردوە."

[105] ١ـ ڕۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. ژمارە ۲٤٥ لاپەرە ۲۰، ۲ـ سەفەری پێگەڕانەوە، لاپەرە ۱۸۱

[106] ١ـ کورتە مێژووی ح.د.ك.ئ لاپەرە ۱۰۱، ۲ـ سەفەری پێگەڕانەوە لاپەرە ۱٤۱

"بە گوێرەی ماددەی ٢١١و ٢٥و "ئبصرە"ی ٢و ٢٣و ٥٢ی قانوونی جەزایی ئاڵمانی فیدراڵ (STGB) ناوبراو وەك تاوانبار شیاوی سزادانە."

لەنێو کوژراوەکان دا دوکتور "شەرەفکەندی" سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هەیە. کە ئەو حیزبە گەورەترین و لە ئەزمر سیاسی یەوە گرینگترین رێکخراوی ناوچەی کوردنشینی ئێرانەو بە یەکێك لە بەرچاوترین هێزی ئۆپوزیسیۆنی ئێرانی دەژمێردرێ."

رۆژی ١٧ی سێپتامبری ١٩٩٢ نزیك کاتژمێر ٨ی شەو، دوکتور شەرەفکەندیو هاورێیانی لە رێستۆرانی میکۆنووس پرێسزر پلالز(Praser Plalz) کۆ دەبنەوە تا لەگەڵ نوێنەرانی ئۆپوزیسیۆنی ئێرانی لەسەر مەسایلی سیاسی ئاڵوگۆڕی بیروڕا بکەن. لە ژوورەکەی تەنیشت ئەم رێستورانە دا سەرجەم ٩کەس دەبن کە کاتژمێری ١٠/٥٠ دەقیقە دوو پیاوی چەکدار بە موسەلسەلێکی IMI کالیبر ٩ میلیمیتری، دەمانچەی لاما (Lima)ی کالیبر ٧/٦٥ میلیمیتری هێرش دەکەنە سەر سالۆنی نان خواردنو راستەوخۆ "بە نامانجەوە" تەقە لە دوکتور "شەرەفکەندی"و عەبدولیو ئەردەلانو نووری دەکەن کە بە هیچ جۆر چاوەڕوانی هێرشێکی وایان نەدەکرد. لە ئاکام دا هەر چوار کەس کە گوللەیەکی زۆریان وێکەوتبوو دەکوژرێنو عەزیز غەفاریش بریندار دەبێ.

یەکێك لەو دوو کەسەی کە تەقەیان کردووە بە ناوی عەباس راحل خەڵکی لوبنان لە رێکەوتی ٤ی ئۆکتۆبری ١٩٩٢ دا شناسایی و دەستبەسەر کرا. شوێنی قامکی ناوبراو لەسەر ئامرازی قەتڵەکە (دەمانچەکە) بەجێمابوو کە ناسراوە. لەگەڵ عەباس لوبنانی یەکی دیکە بە ناوی یووسف ئەمین دەستگیر کرا کە لە کاتی لێکۆڵینەوە لەبەردەم قازی ئیقراری کرد کە لە کاتی تیرۆرەکە دا لە میکۆنووس کێشکی داوە بە دوای ئەو ئیعترافاتانە دا، کازم دارابی خەڵکی ئێران لە ٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩٢ دا، دەستبەسەر کرا.

"ئەمین" ناوبراوی وەك سەرۆکی عەمەلیاتو کەسێك ناوبرد کە حەقدەستی تیمی تیرۆرو خەرجی تیرۆرەکەی دابین کردوە.

لە رێکەوتی ۲۸ی ئۆکتۆبری ۱۹۹۳دا لە دادگای عالی جینایی بێرلین دژی ئەو سێکەسەو دوو نەفەری دیکە کە گومانی هاوکاری کردنیان لەو جینایەتە دا لەسەرە دادبینی بەرێوە دەچێ.

گومان لێکراو "فەلاحیان" لە پیلانی تیرۆری ۱۷ی سێپتامبری ۱۹۹۲ دا وەك تاوانبار بە شێوەی خوارەوە شەریكو هاودەست بووە.

لە کاتی بەرێوەبردنی پیلانەکە دا "فەلاحیان" سەرۆکی وەزارەتی ئاسایشو ئەمنییەتی کۆماری ئیسلامی "واواك" بووەو ئێستاش هەر سەرۆکی ئەو وەزارەتخانەیەیە. ئەو وەزارەتخانەیە بە هەموو بەشە زانیاری یەکانی خۆیەوە لەگەڵ سوپای پاسدارانو بە تایبەت لەگەڵ واحید "قدس"ی سوپا پێوەندی یەکی راستەوخۆی زۆر پتەوی هەیە. ئەو مەسەلەیە نیشاندەری هەڵوێستی کۆماری ئیسلامی سەبارەت بە ئەفرادو رێکخراوە سیاسی یەکانی ئۆپوزیسیۆنی ئێرانی یە کە کۆماری ئیسلامی نەك هەر قەدەغەی کردون، بەڵکوو لە دەرەوەی وڵاتیش نوێنەرەکانیان هەر تەعقیب دەکا. گومان لێکراو فەلاحیان ئەو مەسەلەیەی لە بەرنامەیەکی تەلەویزیۆنی دەوڵەتی دا لە رێکەوتی ۳۰ی ئووتی ساڵی ۱۹۹۲ بە ئاشکرا راگەیاندو بە شێوەی راستەوخۆ ناوی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانی هێنار بە عینوانی یەکێك لەو رێکخراوانە ناوی برد کە وەزارەتخانەکەی لە تەعقیبیان دایە.

"ئێمە بەشێکی زانیاریمان هەیە لەدژی گرووهەکەکانی دژی شۆرش کار دەکەن. ئێمە توانیومانە لە ئۆرگانەکانی ناوەندیی ئەو تاقمانە دا نفووز بکەینو زۆربەی ئەوان لە وڵات هەڵاتوون. ئێمە عەمەلیاتی خۆمان درێژە پێدەدەینو تەعقیبیان دەکەین بە شێوەی رێکوپێك لە دەرەوەی وڵاتو لەژێر چاوەدێریمان دان. ئێمە لە ئۆرگانەکانی ئەوان دا

دەستمان هەیەو لە کارو تێکۆشانیان ئاگادارین. ئێمە توانیومانە لە بەشێکی زۆر لەو گرووهانە لە دەرەوەی وڵات یا لەسەر سنوورەکان زەربەیان لێ بدەین.

هەروەك دەزانن یەکێك لەو گرووهەکە هەڵسووڕانە، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە. ئێمە توانیمان ساڵی رابردوو زۆر زەربەی کاریگەر لە ئەندامانی بدەین. زەربەی زۆر سەخت لە ئۆرگانی مەرکەزیو ئۆرگانەکانی دیکەیان کەوتو تێکۆشانیان کەم بۆوە."

لە کوشتنی دوکتور "قاسملو" لە ١٣ی ژوونیەی ساڵی ١٩٨٩ دا ئەو راستی یەی دەرخست کە بە دوا شوێن پێ داچوونی ئەیارانو نوێنەرەکانیان تەنانەت لەنێوبردنی ئەوانیش دەگەرێتەوە. لە کاتێك دا دوکتور قاسملوو و نوێنەرەکەی "عبدالله قادری ئازەر" لە میانەی وتووێژی نهێنی لەگەڵ وەفدی نوێنەوایەتیی ئێران بە دەستی ئەندامانی ئەو وەفدە کوژران. حوکمی گرتنی ئەندامانی وەفدی ئێران لە ئوتریش (ئەمسا) لە لایەن دادگای جینایی ڤییەن دەرچوو. یەکێك لە ئەندامانی ئەو وەفدە "جعفر صحرا رودی" بوو. لە حاڵی حازر دا جێگری فەرماندەی ستادی سوپای پاسدارانە. واحیدی "قودس"ی سوپای پاسداران کارەکەی بەربەرەکانی دژی موخالیفانو بەڕێوە بردنی پیلانی تیرۆرە.

لەبەین بردنی هێزەکانی ئۆپوزیسیۆن لە دەرەوەی وڵات لە لایەن حکوومەتی ئێران تەنیا مەربووت بەو رووداوە تایبەتی یە نیە. ئەو مەسەلەیە بەو رووداوانەی خوارەوە سابیت دەبن.

دادگای جینایی پاریس لە ٦ی دیسامبری ١٩٩٤ تا ١٦ی ژوونیەی ١٩٩٥ دا سەرجەم ٨کەس ئێرانیی لەسەر بەشداریکردن لە کوشتنی "بەختیار" سەرۆك وەزیری پێشووی ئێران لە ٦ی مانگی ئووتی ١٩٩١ لە پاریس بە بەندی هەمیشەییو درێژخایەن مەحکووم کرد. لەو دادگایە دا روون بۆوە کە ئەندامانی بنیاتەکانی دەوڵەتیی ئێران وەك وەزارەتی پۆستو تێلێگراف، تەلەویزیۆن، وەزارەتی دەرەوە لە بەرنامە دارشتنو تەداروك کردنو بەڕێوەبردنی ئەو پیلانە تێرۆریستی یە دا بەشدار بوون. بە قسەی شاهیدەکان دوو کەس

لەوانە ئەندامی وەزارەتی ئاسایش یا سوپای پاسدارانن کە ئەم دوو ئۆرگانە پێکەوە پێوەندیی زۆر نزیکیان هەیە.

پرۆفسۆر دوکتور "گەنجی" وەزیری پێشووی فێرکردنو بارهێنان (وەزارەتی تەربیە)ی ئێرانو رێبەری یەکێك لە رێکخراوە رکەبەرەکانی دەوڵەتی ئێران بە ناوی "درفش آزاد"ی لە رەوتی لێکۆڵینەوەو دادبینی دادگای تاوانکاری دا وەك شاهید رای گەیاند کە ئەو بەر لە تێکۆشانی لە ریزی ئۆپوزیسیۆن دا لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بە هەرەشەی مەرگی لێکراوە. دوو کەس لە یارمەتیدەرە نزیکەکانی کوژران.

لە رێکەوتی ١٦ی مارسی ١٩٩٣ نووسراوەیەك بە ناوی کۆماری ئیسلامیی ئێران لەو پێوەندییە دا بە ئیمزای دادستانی گشتیی شۆرش نیشان درا. ئەو بەڵگەیە کە لە رێکەوتی ٨ی دیسامبری ١٩٩٤ دا لە لایەن شارەزایانی رێکخراوی زانیاری (کارشناسان سازمان اطلاعاتی) ئاڵمان "بە ئیحتمالی بەهێز" وەك ئەسڵ هەڵسەنگێنرا، لێدوانی دوکتور گەنجی سەلماندیو لە هەمان کاتیش دا خستنە رووی ئەو راستی یەش بوو کە لە پەنا وەزارەتی دەرەوە دا وەزارەتی "تاوانبار" فەلاحیان زیاتر لە ئەوانی دیکە لە بەرێوەبردنی حوکمی کوژرانی دوکتور شاپووری بەختیار دا بەشدار بووە. بەو جۆرە لە رابەرایەتی کردنو هەنگاوناننو هەڵبژاردنی سیخوری تێرۆریستی پەروەردە کراو و دابینکردنی ئیمکاناتی ئەنجامدانی پیلانەکە ئەرکی وەزارەتی "تاوانبار" بووە.

لە ١٦ی ژانویەی ١٩٨٧دا "علی محمدی" سەر فرۆکەوانی دەوڵەتی ئێران لە شاری هامبورگ لە لایەن کەسی نەناسراو بە گوللە تیرۆر کرا.

لە ٢٦ی ئووتی ساڵی ١٩٨٩دا "جوادی" ئەندامی ئۆپوزیسیۆنی ئێران لە لایەن کەسانی نەناسراو لە "قبرس" تیرۆر کرا. جێی ئاماژە پێکردنە لە هەردووکی ئەو رووداوانە دا چەکەکانو دەنگ بڕی ئەو چەکانە دۆزرانەوە. بەراورد کردنی ئەوان لەگەڵ ئەو

دەنگ بڕانەی لە کردەوەی میکۆنۆوس دا بەکار براون، دەسەلمێنن کە ڕێکچوونیان پێکەوە زۆرەو تایبەتمەندی یەکانیان لە زۆر بوارەوە یەك دەگرنەوە.

بە گوێرەی ئەم بەڵگانە لەنێوبردنی ئۆپۆزیسیۆن ئەرکی سەرەکیی وەزارەتی "اطلاعات و امنیت"ەو ڕێکخراوەکانی سەر بەو وەزارەتخانەیە سەرۆکی ئەو وەزارەتخانەیە، فەلاحیان بێجگە لەو بەرپرسایەتی یە، ئەندامی ئەنجومەنی ئەمنییەتی میللیی وڵاتیشە. لەو ئەنجومەنە دایە ئەو بەرنامە تیرۆریستی یانە دادەڕێژرێن‌و بڕیاری جێبەجێ‌کردنیان لەسەر دەدرێ.

ئەو گومانە بەهێزە کە ڕووداوی میکۆنۆوس لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە کراوە ئاکامی ئەو لێکۆڵینەوە، هەڵسەنگاندن‌و ئەنجامگیری یە کە لە زانیاری یە جۆراوجۆرەکان بەدەست هاتوە کە ڕاستەوخۆ پێوەندی یان بە پیلانەکەوە هەیە.

تۆمەتبار "ئەمین" لەو ئیقرارە کە لەبەردەم قازی کردوویەتی‌و وەك سەنەد بە نووسراوەو بە زەبت کراوی هەیە. ئاماژە بە وتووێژی نێوان هاوکارانی قەتڵەکە دەکات‌و ئەو ڕاستی یە خۆدەنوێنێ کە ئێران پشتگیر‌و ماکەی ئەسڵی تاوانەکە بووە، ئەگەر یەکێك لە تیرۆریستەکان گیرا، ئێران بە هانایەوە دێ.

"کازم دارابی" لە بنەڕەت دا ئێرانی یە، عامیلی سەرەکی تیرۆر‌و بازنەی پێوەندیی نێوان بەرپرسانی ئێرانی‌و ئەندامانی "حزب الله"یە کە بەڕێوەبەر‌و مەهارکەری ڕاستەوخۆی ڕووداوەکە بووە. بە گوێرەی زانیاری سازمانی ئەمنییەتیی نێوخۆی ئاڵمان (BFV)‌و سازمانی ئەمنییەتیی نێوخۆی بێرلین (LFV)‌و سازمانی زانیاری (اطلاعات)ی ئینگلیس، کازم دارابی سیخوڕی سازمانی زانیاریی ئێران (واواك)‌و ئەندامی سوپای پاسدارانە. کەواتە لەژێر ڕێبەری‌و چاوەدێریی "متهم" فەلاحیان دا کاری کردوە. بەپێی ئیعترافی "ئەمین" دارابی بەرلەوەی تیمی تیرۆری میکۆنۆوس بەرێتە ماڵی

نهێنی لە سێنف بێرجێرینگ ( Senfbergerring – V) ئەوانی لە ماڵی دووهەمی خۆی دێتمۆلدێر سیتێرکوو (Detmolderstrcu) حەشار دابوو.

ـ بە پێی ئەو مەعلووماتانەی کە دەزگای زانیاریی نێوخۆی ئاڵمان داویەتی بە ئۆرگانەکانی لێکۆڵینەو، ئەندامانی وەزارەتخانەی "فەلاحیان" یان تەشکیلاتی ژێر ڕێبەری ئەو ڕاستەوخۆ لە تیرۆری "میکۆنووس"دا بەشدار بوون.

ـ متهم "ئەمینو راحل" کە ئەنجامدەرانی ڕاستەوخۆی ڕووداوەکەی میکۆنووسن کە لە لایەن ئێرانەوە پشتیوانی یان لێ دەکرێ‌و لە پادگانێکی ئامووزشی سوپای پاسداران دا خولی تایبەتی یان بینیوە.

ـ سەبارەت بە "حەیدەر" شۆفێری ئەو ماشێنەی کە قاتڵەکان پاش بەڕێوەبردنی تیرۆرەکە پێی دەرباز بوون حوکمی گرتنی دەرچورە. بە پێی قسەی شاهیدەکان ناوبراو بە دوای ڕاکردنی لە ئاڵمان ئێستا لە ئێران ژیان دەباتە سەر.

ـ کڕیاری ئەو ماشێنەی کە تاوانبارەکانی پێ‌دەرچوون بە ناوی "علی صبرا" دوای ونبوونی لە ئاڵمان، کە پۆلیس لە هەوڵی گرتنی دابوو، دەرکەوت کە لە لایەن یەکێك لە شاهیدەکانەوە لە کاتی چوونە ژوورەوە بۆ بارەگای قەرارگای ئەسڵی "حزب الله" لە بیروت بینراوە.

ـ یەکێك لەو چەکانە کە لە ١٧ی سیپتامبری ١٩٩٢دا بۆ تیرۆری "میکۆنووس" بەکار هێنراوە لە مەوجوودی چەکی ئەنباری ئەرتەشی شای پێشووی ئێرانە.

ـ یەکێك لەو دوو کەسە کە لە ڕێستووران وەژوور کەوتوون بەر لەوەی کوژراوەکان بدەنە بەر دەسترێژ بە زمانی فارسی جنێویان پێ‌داون.

ـــ "تاڵەبانی" ڕێبەری کوردەکانی عێراق‌و یەکێك لە دۆستەکانی دوکتور "شەرەفکەندی" کوژراو، شەوی دوای ڕووداوەکە بە بەرپرسانی لێکۆڵینەوەی گوتوە کە ئەو تیرۆرە لە لایەن ئێرانەوە کراوە. ئەو زانیارییەکانی بەر شێوەیە داون: "دوای دەسگیر

کرانی چەند کەس لە پاسداران لە لایەن پێشمەرگەکانی کوردی عێراقی لە مانگی نـووتی ۱۹۹۲ دا پیلانی لەو بابەتە ئاشـکرا کـران. "تالـەبانی" چـەند حـەوتوو پـێش تیـرۆری "میکۆنووس" بوونی ئەو پیلانەی بە دوکتور شەرەفکەندی راگەیاندبوو. "

ـ "برند اشمیت باور" وەزیری موشاویر بۆ کاروباری ئەمنییەتی ئاڵمان کـە لـە رەوتـی دادبینی دادگای بەرزی تاوانکاری بێرلین دا وەك شاهید قسەی دەکـرد، پەسـندی ئـەوەی کرد کە "فەلاحیان" لە تیرۆری "میکۆنووس" دا دەستی هەبووە. لە درێژەی لێدوانەکـەی دا گوتی: "فەلاحیان" زۆر هەوڵی داو فشاری هێنا بۆ سەر ئاڵمان تـا پێشـی پێکهـاتنی دادگای "میکۆنووس" بگرێ.

ئاکـامی لێکۆڵینـەوە ئـەو راسـتی یـەی دەرخسـت لەسـەر ئـەنگیزەو رێخۆشـکردنی هەلومەرجێك کە شەرتی بنەڕەتی تیرۆرەکە (قـازانجی ئێـران، هەڵوێسـتی کاربەدەسـتانی ئێرانی لەبەرامبەر ئۆپوزیسیۆن دا، تەرحو بەرنامەرێژی ئەنجام دراو لەئێران، بـەڕێوەبردنی پیلانـی بێـرلین لـە ۱۷ی سـێپتامبری ۱۹۹۲، دەخالـەتی کەسـانێك کـە راسـتەوخۆ یـا ناڕاستەوخۆ لەو پیلانە دا بەشداربوون) روون دەکاتـەوە کـە "فـەلاحیان" لـە لایـەك وەك سەرۆکی وەزارەتخانـە لـە لایـەکی دیکـەوە، ئەنـدامی ئەنجومـەنی ئەمنییـەتی میللـیو فەرمانـدەهی کـردنو پێکهێنـانی تیمکانـات دا بـۆ تیرۆریسـتەکان لـە کـردەوەی ۱۷ی سێپتامبری ۱۹۹۲ دا شەریك بووە.

"ئەو بەڵگەو دەلیلانەی کە تاوانی میکۆنووس لەسەر فەلاحیان سابیت دەکـەن بـریتین لە:

۱ـ قسەی شاهیدەکانو کارشناسان لە دادگاو لێکۆڵینەوە دا،

۲ـ قسەو ئیقراری گومان لێکراو "ئەمین"،

۳ـ قسەی شاهید "گرونە والد" لە (BFV)،

٤ـ قسەی شاهید "ئانوسك" لە (LFV)،

٥ـ قسەی شاهید پرۆفسۆر "گەنجی"،

٦ـ قسەی شاهید "استو ویتس لە (پۆلیسی جینایی ویەن)،

٧ـ نەزەری کارشناس پرۆفسۆر دوکتور "اشتاین باخ" لە (ئەنستیتۆی رۆژهەلاتناسی هامبورگ)،

٨ـ نەزەری "بن اشتاین" لە (پۆلیسی فیدرالی ئالمان لەسەر چەکەکانو دەنگ برەکان)،

٩ـ حوکمی دادگای جینایی پاریس بە تاریخی ٦ی دیسامبری ١٩٩٤و ١٦ی ژوونیەی ١٩٩٥،

١٠ـ دەستووری کوژرانی دوکتور "گەنجی"،

١١ـ حوکمی جەلبی دادگای جینایی ویەن.

تیرۆرەکە فیلبازانە ئەنجام دراوەو هەموو تایبەتمەندی یەکی کوشتنی تێدایە.

"فەلاحیان" بە بیرۆکەیەکی پەست کارەکەی کردوە. ئەو لەخۆڕا خۆی کردوە بە خاوەنی مەرگو ژیانی خەلکی دیکەو ئەوەش نیشاندەری ئەوەیە کە کارەکە بە ئەنگیزەیەکی پەست بەرێوە چووە.

بۆیە حوکمی گرتنی بەرامبەر پاراگرافی ١١٢ی "تبصرە"ی ٣ی قانوونی جینایی دەرچووە. بە گوێرەی قانوونی ئەساسی ئەو خالانەی خوارەوە بوونە هۆی دەرچوونی ئەو حوکمە.

ـ گومان لێکراو بە دلخواز، خۆی تەسلیمی قانوون ناکا،

ـ بێ‌گوانی دەست بەجێی گومان لێکراو روون بوونەوەی تیرۆرەکە دەکەوێتە مەترسی‌یەوە،

ـ دەستووری جەلب لە پێناوی روون بوونەوەی راستی دایە. لەو پێوەندییە دا سەرنج دان بەو خالانەی خوارەوە پێویستە:

ا ـ کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێرانو باڵوێزی کۆماری ئیسلامی ئێران چەندین جار بەشداربوونی گومان لێکراویان لەو تیرۆرە دا وەدرۆ خستۆتەوە. ئەو راستی یە لەبەرچاوان کە گومان لێکراو نیشتەجێی دایمی ئێرانە (لانیکەم لە حاڵی حازر دا) بە دڵخوازی خۆی لە دادگا حازر نابێو بە پێچەوانە زۆریش هەوڵ دەدا کە نەیەتە ئاڵمان.

پاراگرافی ۲۰ GVG کە بە گومان لێکراو مافی "مصونیت" دەدا ئەگەر وەك نوێنەری کۆماری ئیسلامی بێتە ئاڵمان، متمانەیەکی سنورداری بێ.

بە دەرچوونی حوکمی جەلب ئیمکانی ئەوە دێتە پێش کە ئەگەر ناوبراو بۆ وڵاتێکی سێهەم سەفەر بکاو، دەسگیر بکرێ تەحویلی ئاڵمان بدرێ.

ب ـ لە جەرەیانی کاری دادگای "میکۆنووس" لە دادگای باڵای بێرلین دا، زانیاری یەکی زۆر لە کەسو کارو نزیکانی گومان لێکراوەکان کە لەگەڵ "حزب الله" پێوەندی یان هەیە وەدەست کەوت کە نیشانی دەدا گومان لێکراوەکان پێش بازجوویی کردن لەدادگا کەوتوونە ژێر فشار بۆ ئەوەی ئەو شتەی لە لای پۆلیس گوتوویانە وەری بگرنەوە یان لە دادگا دووپاتی نەکەنەوە. تەنانەت دادگا دەلیلی دووکەس لە شاهیدەکانی قبووڵ کرد کە لەبەر ئەو فشارە حازر نەبوون ناوی خۆیان بدەن، چونکە گیانیان لە خەتەر دابوو "ئەوانە پێشتر لە لایەن ئاغای ئەبولحەسەن بەنی سەدر ناسێندرابوون، چونکە ئاغای بەنی سەدر لەبەردەم دادگا دا گوتی: "ئەو دەستوورە کەتبی یە کە بۆ کوشتنی دوکتور شەرەفکەندیو هاورێیانی لە لایەن "خامەنەیی"و "رەفسەنجانی"یەوە دراوە لە بەردەست دایە."

نەزمری کارشناس پرۆفسۆر دوکتور "اشتاین باخ" لە راپۆرتی نووسراوی خۆی دا بە تاریخی ٥ی ئاوریلی ۱۹۹۳ سەبارەت بە پێوەندیی "حزب الله"ی ئێران لە گەڵ قسەکانی گومان لێکراو "فەلاحیان" لە تەلەویزیۆنی ئێران لە ۳۰ی ئووتی ۱۹۹۲ داو هەروەها قسەو ئیقراری گومان لێکراو "ئەمین" لەبەرامبەر قازیی تەحقیق لە دادگای بەرزی ئاڵمان دا دەیسەلمێنێ کە فشارهێنان بۆ سەر گومان لێکراوەکان لە لایەن ئێران یا بە

داواکاریی ئێران ئەنجام دراوە. بۆیە دەبێ قبوڵ بکرێ کە گومان لێکراو بەرپرسی کارەکە بووەو ڕاستەوخۆ لە تیرۆرەکە دا بەشداری کردوە. بۆیە گومان لێکراو هەموو توانای خۆی بەکار دێنێ تا ڕاستی یەکان ئاشکرا نەبن.

ج: بە گوێرەی ئەو زانیاری یانەی کە بە دەستەوەیە ئیمکانی هەیە گومان لێکراو جیناياتێکی زیاتری لەو بابەتە ئەنجام بدات. کوشتنی دیپلۆماتی پێشووی ئێران "کازم ڕەجەوی" لە ٢٤ی ئاوریلی ١٩٩٠ لە دەوروبەری ژنێڤ، کوشتنی سەرۆك وەزیرانی پێشووی ئێران "بەختیار" لە ٦ی ئوتی ١٩٩١ لە دەوروبەری پاریس، کوشتنی "نەقدی" دەبیری شووڕای میللیی بەرگری ئێران، بەشی ئیتالیا، لە ٦ی مارسی ١٩٩٣ لە ڕۆم، هەموو لە زەمانی بەرپرسایەتیی گومان لێکراو لە لایەن وەزارەتی ئاویراوەوە بەڕێوە چوون.

د: لەبەر قورس بوونی تاوان دەستووری بازداشتی گومان لێکراو "فەلاحیان" دەردەچێ.[107]

**٢٤ی مارسی ١٩٩٦**

**دوکتور "ولست" Dr. Wolst**

**قازی دادگای عالی ئاڵمان**

107 ١ـ سەلامی عەزیزی، سەفەری بێگەرانەوە، لاپەرەی ١٤١، ١٤٢ ٢ـ ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ٢٣٧ ، ٢٤٢

## پارلمانی ئاڵمان

پارلمانی ئاڵمان لە کۆبوونەوەی رۆژی ١٧ی ئاوریلی ١٩٩٧ دا سەبارەت بە ئیران بەم جۆرە هەڵوێستی خۆی دەربڕی:

"ئەندامانی پارلمانی ئاڵمان بە گشتی بەشداریی دەوڵەتی ئیران لە تیرۆری (شەرەفکەندی) لە بێرلین دا وەك لەژێرپێنانی ئاشکرای مافە نێونەتەوەیی یەکان مەحکووم کرد... داوا لە دەوڵەت کرا پێوەندیی نهێنیی و هاوکاری لە بواری کاروباری ئەمنییەتی لەگەڵ ئیران دا کۆتایی پێبهێنێ."[108]

## هەڵوێستی حکوومەتی ئاڵمان

بەدوای دەرچوونی حوکمی لێبڕاوانەی دادگای میکۆنووس و بڵاوبوونەوەی لە راگەیەنە گشتی یەکان، هاوکات حکوومەتی ئاڵمان لە بەیاننامەیەکی رەسمی دا رایگەیاند کە دەخالەتی سەرانی دەوڵەتی ئیران لە رووداوی میکۆنووس دا "پێشێل کردن"ی مافی مرۆڤو لادانێکی ئاشکرایە لە یاساکانی نێونەتەوەیی و ئاڵمان ناتوانێ تەحەمولی کردەوەی وا بکا. لەو بوارە دا ئەو بڕیارانەی خوارەوەی دا:

١ـ سەفیری ئاڵمان لە ئیران فەوری بانگ بکرێتەوە بۆ ئاڵمان

٢ـ بە سیاسەتی دیالۆگی رەخنەگرانەی خۆی لە بەرامبەر ئیران دا کۆتایی بێنێ

٣ـ چوار کەس لە دیپلۆماتەکانی ئیرانی لە ئاڵمان وەدەرنێ

ئەو بڕیارە ئازایانەی دادگای میکۆنووس بوو بە وێردی سەرزمانو مانشێتی گەورەی رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئاڵمانو چەند نموونەیەکی دەخەینە روو:

[108] ١ ـ رۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی (ح. د.ك .). ژمارە ٢٤٤ ، لاپەرە ٢ ، سالی ١٩٩٧ ٢ ـ مهران پاینده، عباس خداقلی ، حمید نوذری، هنوز در برلین قاضی هست ، ناشر نشر نا ، چاپ دوم ، سال ٢٠٠٠ ، محل المان فدرال، اسن

ئەوە یەکەم جارە کە دەزگای قەزایی بەسەر سیاسەتو ئابووری دا سەردەکەوێ "فرانکفۆرتێر الگمانیە"

مەسەلەی دادگای میکۆنووس لەمێژووی قەزایی ئاڵمان دا بە یادگار دەمێنێتەوە "زیدویچە زاینونگ"

ئیدی هیچ بروبیانوویەك بۆ کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئاڵمان نەماوەتەوە کە لەگەڵ ئێران سازشکاری بکەن "تایگە زاینونگ"

ئاڵمان نابێ نیگەرانی تێکچوونی پێوەندیی ئێرانو ئاڵمان بێ چونکە لەو حاڵەتە دا ئەوە ئێرانە کە گەورەترین زەرەری وێ دەکەوێ "بێرلین سایتونگ"[109]

## بەندی دووهەم:

## دوو روانگەی جیاوازلەسەرحوکمی فەلاحیان

ا: بە دوای فەرمانی گرتنی عەلی ئەکبەر فەلاحیان وەزیری ئیتلاعاتو ئەمنییەتی ئێران لە لایەن قازی دادگای بەرزی ئاڵمان بە تاوانی پیلان دارشتنو کوشتنی دوکتور "شەرەفکەندی" بوو بە مایەی خۆشحاڵیو رەزامەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران وەك خاوەن سکاڵاو لەو بارەیەوە رۆژی ١٦/[illegible]/١٩٩٦ی زایینی بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوە. لە بەشێك لەو بەیاننامەیە دا هاتوە:

"دوو ساڵونیو دوای دەست پێکردنی دادگای بێرلین، تایبەت بە موحاکەمەی قاتڵەکانی سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دوکتور "محەممەد سادق شەرفکندی"و هاورێیانی، دادستانی ئاڵمان رۆژی پێنج شەممە ١٩٩٦/٣/١٤ بە هەنگاوێکی بوێرانەو ئازایانە حوکمی ئێونەتەوەیی گرتنی "عەلی فەلاحیان" وەزیری "اطلاعات"ی کۆماری ئیسلامیی ئێرانی دەرکرد. ئەو کارەی دەزگای قەزایی ئاڵمان لەگەڵ خۆشحاڵیو رەزامەندیی

[109] ١ـ رۆژنامەی کوردستان، ئۆرگانی (ح. د.ك .)، ژمارە ٢٤٤ لاپەرە ٣٦، ٢ـ سەلامی عەزیزی ، سەفەری بێگەرانەوە، لاپەرە ١٩٧

هەموو ئۆگرانی حەق و عەدالەت لە دنیا دا بەرەو روو بووەو، لە بەرامبەر دا بوو بە هۆی تووڕەیی و نارەزامەندیی کاربەدەستە تیرۆریست پەروەرەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێران.

تاوانبارکردنی وەزیری "اطلاعات"ی کۆماری ئیسلامی بە تیرۆری رێبەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و هاوڕێیانی، ئەویش بە شێوەی رەسمی و لە لایەن دادستانی یەکێک لە ولاتانی موعتەبەری جیهانەوە کە پێوەندی یەکی نیزیکی ئابووری و بازرگانیی لەگەڵ کۆماری ئیسلامیی ئێران هەیە، نیشانەیەکی ئاشکرای ریسوایی و بێ ئیعتیبار بوونی ئەو رێژیمە لەپێش چاوی خەڵکی دنیایە. بەیاننامەی دادستانی ئاڵمان لە راستی دا تاوانبار کردنی تەواوەتی دام و دەزگای کۆماری ئیسلامیی ئێران بە تیرۆری رێبەرانی ئۆپوزیسیۆنی ئێرانە. چونکە وەك هەموو لا دەزانن فەرمانی تیرۆری ئەو شەخسییەتانە لە لایەن بەرزترین کاربەدەستانی رێژیمەوە دەردەچێ و لەدوایە جێبەجێ کردنەکەی بە هێندێ مزوری وەك "عەلی فەلاحیان" دەسپێردرێ.

ئێمە لە کاتێك دا خۆشحالیی خۆمان لە دەرچوونی حوکمی گرتنی "عەلی فەلاحیان" لە لایەن دادستانی ئاڵمانەوە دەردەبڕین، لە دڵەوە پیرۆزبایی بە دەزگای قەزایی ئاڵمان دەڵێین و دەرچوونی ئەو حوکمە بە نیشانەی سەربەخۆیی دەسەلاتی قەزایی ئاڵمان و رێزدانانی دەوڵەتی ئاڵمان بۆ ئەو سەربەخۆیی یەی دەزگای قەزایی دادەنێین... .[110]

## پەلەقاژەی ئێران

براون: دەوڵەتی ئاڵمان لە کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی ولاتانی ئەورووپا دا باسی کرد کە بە نیسبەت دژکردەوەی ئێران لەبارەی حوکمی دادگای میکۆنوس مەترسیی جیدی هەست پێدەکرێ. بە تایبەتی لەبارەی هێرش بە سەفارەتی ئاڵمان لە تاران و مەترسیی دەست درێژی بۆ سەر گیانی ئاڵمانی یەکان. بۆیە لە هەموو ئەورووپایی یەکانی داوا کرد لەو بوارەوە ئێران ئاگادار بکرێتەوە.

---

[110] رۆژنامەی کوردستان، ئۆرگانی (ح. د. ك.). ژمارە ۲۳۱ لاپەرە ۲۶

چونکە دەوڵەتی ئێران لە ڕەوتی بەرەوپێش چوونی دادگای میکۆنوس دا بە شێوەیەکی سیستماتیك لە هەموو ئیمکاناتێك کە لە ئیختیاری دا هەبوو، کەلکی وەرگرت بۆ پێش گرتن لە پێکهێنانی دادگاو بە لاڕێ دابردنی پرۆسەی دادبینیی قاتڵەکان کە بە جۆرێك ئەگەر نەیتوانی بەرگری لە ڕەوتی دادگا بکات، لانیکەم مەسەلەکە پێوەندی نەدرێتەوە بە سەرانی ئێران، بۆیە لەو بارەوە ئەم هەنگاوانەی هەڵێناوە:

ـ فشار هێنان بۆ دەوڵەتی ئاڵمانو سوور ئیستفادە کردن بە دەست بەسەر داگرتنی کەسانی ئاڵمانی لە ئێران دا، دانی باجی ئابووریو هەڕەشە کردنو دەست بەسەرکردنی بنەماڵەکان لە ئێرانو لێ دانی تۆمەتی دزیو ڕشوە خواردن.

ـ هەڕەشە لە شایەدەکانی ئۆپوزیسیۆن بۆ نموونە هەڕەشەکانی تەلەفونی، تەعقیبو تەهدیدی ئاشکرا، داواکاری بۆ تەحویل دانەوەی شایەدەکان بە ئێران.

ـ هەڕەشە لە تەماشاچییەکان (جمهور).

ـ هەڕەشە، کڕینو پەیداکردنی شایەدەکانی موافقی ڕێژیم کە لە دادگا دا بە نەفعی ڕێژیم شایەدی بە درۆ بدەن بۆ چەواشە کردنی ڕاستی یەکان.

ـ هەڕەشە لە تۆمەتبارەکان بۆ ئەدرکاندنی ڕاستی یەکان.

ـ هەڕەشە لە پارێزەرەکانی "وکلا" تاوانبارەکان.

ـ هەڕەشە لە پارێزەرەکانی شاکی یەکانی تایبەتی.

ـ هەڕەشە لە دادستان و دادوەرانی دادگا دەکا.[111]

[111] مهران پاینده، عباس خداقلی ، حمید نوذری، هنوز در برلین قاضی هست ، ناشر نشر نما ، چاپ دوم ، سال ۲۰۰۰ ، محل المان فدرال، اسن

لاپەڕە ۲۱۱

## لە یاسادا راستی‌یەکان دەردەکەون

رۆژی ١٩٩٤/٤/١٠ی زایینی بە رۆژێکی گرینگ‌و بایەخ دار دادەنرێ لە مێژووی گەلی کوردو حیزبی دێموکراتو بنەماڵەی شەهیدانی بێرلین‌و تێکرای ئازادیخوازانی ئێرانی‌و قوربانیانی دەستی رەشی تاوان. رۆژێك کە هەق بەسەر غەدر دا سەردەکەوێ. لەو رۆژەدا شاری بێرلین دیمەنێکی تایبەتی بە خۆیەوە گرتبوو. بارەگای دادگاو کووچەو شەقامو دەوروبەرو شوێنی دادگا بە شێوەیەکی تەواو تەدابیری ئەمنییەتیی بۆ کرابوو. بە پێی راپۆرتی هەواڵنێرەکان دووهەزار کەس پۆلیس بۆ باری ئەمنییەتی‌و پارێزگاری ئەو ناوە دیاری کرابوو. سەرجەم قازی یەکان‌و فەرمانبەرانی مەحکەمە بە فکرێکی ئارامو لەسەرخۆ کارەکانیان بەڕێوە دەبرد. خەڵکی زۆر لە لایەنە سیاسی یەکان‌و ئوپوزیسیۆنی ئێرانی‌و کوردەکان، ئەندامو لایەنگرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، رێکخراوە جۆراوجۆرەکانی ئێرانی‌و ئازادیخوازانی ئاڵمانی‌و ژمارەیەکی زۆر لە نوێنەرانی دەزگا راگەیەنە گشتی یەکانی جیهانی، لە دەرەوەی هۆڵی دادگا وەستابوون‌و چاوەڕوانی دەرچوونی حوکمی دادگا بوون. دادگایەك کە لەمێژوو دا بە میکۆنووس ناوی دەرکرد.

### حوکمێکی مێژوویی:

سەعات ٩ی بەیانی رۆژی ١٩٩٧/٤/١٠ دادگای میکۆنووس، دادگای موحاکەمە کردنی قاتلانی دوکتور "شەرەفکەندی"و هاوڕێیانی بە بەشداریی دەستەی قازی یەکان، وەکیلەکان‌و تاوانباران دوا کۆبوونەوەی خۆی پێك هێنا. دادگا بە قسەکانی سەرۆکی دادگا دەستی بەکار کرد. سەرۆکی دادگا داوای لە بەشداران کرد بۆ گوێگرتن لە بڕیاری یەکجاریی دادگا هەستنە سەر پێ.

بڕیاری یەکجاریی دادگا بەم جۆرە راگەیەندرا:

١ـ کازم دارابی مەحکووم بە زیندانی هەمیشەیی (ئەبەد)،

٢ـ عەباس راحل مەحکووم بە زیندانی هەمیشەیی (ئەبەد)،

٣ـ یووسف ئەمین مەحکووم بە ١١ ساڵ زیندان،

٤ـ محەممەد عەتریس مەحکووم بە ٥ساڵو ٣مانگ زیندان،

٥ـ عطاالله ایاد ئازاد دەکرێ.

پاشان سەرۆکی دادگا "استدلال"ەکانی دادگای لەبارەی ئەم بڕیارەوە کە ٥٥ لاپەڕەبوو، خوێندەوە.

"ئەمڕۆ دادگا کۆتایی دێ. دادگایەك کە ٢٤٧ کۆبوونەوەی هەبوو و ١٦٧ کەس شایەدی یان تێدا دا. کاتێك کە دادگا لە ٢٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩٣ دا دەست بەکار بوو، روون بوو کە زۆر دەخایەنێ. چونکە تاوانباران مافی ئەوەیان هەبوو کە قسە بکەن. بە تایبەتی پرسیار کردن لە شایەدێك کە لە کانادا بوو، بوو بە هۆی ئەوە کە دادگا چەند مانگ وەدوا بکەوێ.

بابەتی ئەم دادگایە تیرۆرێك بوو کە ١٧ی سێپتامبری ١٩٩٢ لە رێستورانی میکۆنۆس لە بێرلین دا رووی دا کە لەو دا "سادق شرفکندی"، "فتاح عبدلی"، "همایون اردلان" و "نوری دهکردی" کوژران. دادگا نەی دەتوانی تەنیا لەو تاقە مەسەلەیە بکۆڵێتەوە. چونکە کاکڵەی ئەسڵیی رووداوەکە، دیمەنێکی ناتەواو لە مەسەلەکەی نیشان دەدا. بە تایبەتی لە پێوەندی لەگەڵ دارابی دا دەبێ سەیری پشتی مەسەلەکە بکرێ. دەبوایە روون ببێتەوە کە لەبەرچی ئەم کارە کراوەو کێ ئەم کارەی کردوە. لەو بارەوە دەبوایە مافی هەموو کەسێك رەچاو کرابا. پاشان دەبووایە لەو مەسەلەیە کۆڵرابایەوە کە چ کەسێك لە پشت ئەو رووداوەیە. هێندێك شایەد لێرە گوتیان کە شتەکە لە بن سەری ئێران دایە. رۆژنامەکان نووسیان کە ئێران لەسەر کورسیی تۆمەتباری دانراوە و، دادبینی دەکرێ.

ئەوانە هەموو قسەو بۆچوون بوون. لێرە تەنیا ٥ کەس موحاکەمە دەکرێن کە لێرە حازرن و دادگا کەسانی غایب موحاکەمە ناکا. بەڵام دەبوایە بە ڕوونی نیشان درابایە کە کۆمەڵێك کە لەسەر بنەمای قانوون کاروباری خۆی بەڕێوە دەبا و کۆمەڵێك کە بە بنەماو

ژێربینای قانوونیو بەندی ٢ی "پەیماننامەی"ی جیهانیی مافی مرۆڤ (تەزمینو پاراستنی مافی ژیان بۆ هەموو کەس) پابەندەو ئیجازە نادا کەسانێك ببنە کۆسپی سەر ڕێگای تەعقیبو لێکۆڵینەوەی ڕووداوی ئاوا و، بەڕێوەبردنی قانوون لەسەر تاوانبارانو ناساندنی هاندەرانو دەستووردەرانی پشتی پەردە. چونکە بەرپرسایەتیی ئەم ڕووداوە دەکەوێتە سەر ئەوانەی دەستووری ئەو تیرۆرەیان داوە.

مەسەلەکە دەگەڕێتەوە بۆ دوای شۆڕش کە کوردەکان داوای خودموختاری یان هێنایە گۆڕێ. یەکێك لەو ڕێکخراوانە کە بە شێوەیەکی تایبەتی لەژێر چاودێریی دەزگای ئەمنییەتیی ئێران دابووە، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بووەو بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم حیزبە لە سەرووی کارەکانی دەزگای ئەمنییەتیی ئێران دابووە. ئەوان بڕیاریان دا کە ڕێبەرانی ئەم حیزبە لەنێو ببەن. ساڵی ١٩٨٩ چەند کەسی چەکدار لەسەر مێزی وتووێژ دوکتور قاسملوو و دوو کەس لە هاوڕێیانی ئەویان کوشت. تەنانەت بۆ ئەوەی دڵنیا بن کە ئەوان بە زیندوویی نامێننەوە، گوللەی "خلاص"یش لە هەرسێکیان دەدەن. ئەو چەکانەی کەڵکیان لێ وەرگرتبوون لە سەبزی فرۆشێك دۆزرانەوە.

وەزیری ئیتلاعاتی کۆماری ئیسلامی "فەلاحیان" لە ٣٠ی ئووتی ١٩٩٢ دا ڕایگەیاند کە توانیویەتی زەبری کاریگەر لە ڕێکخراوەکانی موخالیف بە تایبەتی لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بدا. ئەو قسانەی فەلاحیان نەك هەر لەبارەی ڕابردووەوە ڕاست بوو، بەڵکوو پێوەندیی بە کارەکانی داهاتووشی یەوە هەبوو. چونکە گوتبووی هەم لە ئێرانو هەم لە دەرەوەی وڵات دا زەبریان لێ دەدا. پاش ئەوەی حیزبی دێموکرات لەدەستدانی دوکتور قاسملووی بە بوونی شەرەفکەندی قەرەبوو کردەوە، شەرەفکەندی دەیویست ئۆپۆزیسیۆن لەگەڵ یەکتر یەکگرتوو بکا. کۆماری ئیسلامیی ئێرانیش بڕیاری دا کە "شەرەفکەندی" بکوژێ.[112]

[112] ڕۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی حدکا، ژمارە ٢٣٢ لاپەڕە ٦ ، ٧

# بەشی شەشەم:
# هەڵسوکەوتی دەوڵەتان بەرامبەر کێشەکە

### بەندی یەکەم:

ا) دژکردەوەی ئێران

رۆژی ٢٤ی مارسی ١٩٩٦ دادستانی فیدراڵی ئاڵمان حوکمی گرتنی "علی فلاحیان" وەزیری ئیتلاعات و ئەمنیەتی کۆماری ئیسلامی ئێرانی بە تاوانی بەشداری لە کوشتنی ریبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و وەرگێرەکەیان ڕاگەیاند. ئەو حوکمە پاش ئاشکرا کردنی بەڵگە نامەیەك لە لایەن "ئیدارەی پاراستنی قانوونی ئەساسی"یەوە (کە یەکێك لە ڕێکخراوە ئەمنیەتی یەکانی ئاڵمانە) دەر چوو. لەو بەڵگە نامەیەدا بە ڕوونی و بە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرەوە هاتووە کە تیمێك لە "**واحیدی تایبەتی عەمەلیاتی دەرەوەی وڵاتی وەزارەتی ئیتلاعات و ئەمنیەتی ئێران**" ڕاستەوخۆ لە تیرۆری دکتۆر "شەرەفکەندی" و یاوەرانی لە ١٧ی سپتامبری ١٩٩٢دا بەشدار بووە و عەمەلیاتەکە بەدەستوور و ڕێنوێنی "علی فلاحیان" ئەنجام دراوە.

پاش دەرچوونی ئەم حوکمە لە لایەن دادستانی فیدراڵی ئاڵمانەوە کار بەدەستانی ڕێژیم لە چەند وتووێژدا بە توندی دژ کردەوەیان لە خۆیان نیشان دا.

هەیئەتی وەزیرانی ڕێژیم لە کۆبوونەوەی ٧٤/١٢/٢٨ خۆیدا ئەم مەسەلەیەی خستە بەرباس و لە دژ کردەوەیەکی توندا دەرچوونی ئەو حوکمەی بە دژی عورف و ڕێوشوێنە نێونەتەوەییەکان دانا و بە راوێژەیەکی پڕ لە هەڕەشەوە بە دەوڵەتی ئاڵمانی ڕاگەیاند: "زۆر دوورە دەوڵەتی ئاڵمان لەگەڵ کردەوەیەکی دژ بە ڕێوشوێنی نێونەتەوەیی ئەو تۆ رازی بێ. باش دەزانن کە ئەگەر ئەو جۆرە بڕیارە نامەنتقی یانە ببنە باو، ئاکامەکەی ئەوە دەبێ کە زۆر لە شەخسیەتەکانی وڵاتانی سەربەخۆ و یەك لەوان ئاڵمان لە دادگاکانی وڵاتانی دیکەدا تاوانبار و موحاکەمە دەکرێن و دڵنیاشین کە دەوڵەتی ئاڵمان حەز ناکا داهێنەری ئەم دابە پڕمەترسی یە بێ."

" آیــتالله یــزدی" سەرۆکی ئەوکاتی دەزگای قەزایی کۆماری ئیسلامی لە نوێـژی هەینی تاران دا وێڕای نارەزایی دەربڕین لەم هەنگاوە گوتی: "ئەم حوکمە زەمینـەی ئـەنجام دانی کردەوەی بەرامبەر و دەرکردنی حوکمی لەو بابەتە لەلایـەن دەزگـای قـەزایی کۆمـاری ئیسلامی ئێران لە دژی ئەو کەسـانەی دەستیان لە کردەوەی جنایەتکارانە و دژی قانوونی دا هەیە خۆش دەکا."ناوبراو وێڕای تاوانبار کردنی ئامریکا و ئیسرائیل بەدەسـت هـەبوون لـە دەرکردنی ئەم حوکمەداو فشار هێنان بۆ سەر دەزگای قەزایی ئالمـان، لـە لایـەك داوای لـە دەوڵەتی ئالمان کرد کە "تەسلیمی فشار و کردەوەکانی دنەدەرانەی ئامریکا و کۆڕو کۆمەڵە سەهیونیستی یەکان نەبێ." و لەلایەکی دیکەشەوە بە هێنانە گۆڕێی ئەو هەڕەشە ئاشـکرایە لە دەوڵەتی ئالمان کە "ئەگەر ئەم وڵاتە حوکمی گرتنی علـی فلاحیـان وەزیـری ئیتلاعـاتی ئێران هەڵنەوەشێنێتەوە، ئێرانیش لە بەرامبەردا کاربەدەستانی پایە بەرزی وڵاتانی ڕۆژئاوایی دەکێشێتە دادگاکان[113]."

"علـی فلاحیـان پـاش ماوەیـك سـکووت و بێدەنگی ڕۆژی ۷۵/۱/۱۳ ڕایگەیانـد کـە دەرچوونی ئەو حوکمە شتێکی بێ بایەخەو دەزگای قەزایی ئالمان لە ژێـر فشـاری دەوڵـەتی ئامریکا و ئیسرائیل دا ئەو حوکمەی دەرکردوە"[114]

ژمارەیەکی بەرچاو لە کار بەدەستانی حکوومەت لەو بارەوە قسەیان کرد و نارەزایەتی‌یان بە نیسبەت ئەو حوکمە دەربڕی.

## ب) کۆتایی‌هێنان بە دیالۆگی ڕەخنەگرانە

شـورای وەزیرانـی دەرەوەی یـەکێتی ئورووپـا ڕۆژی ۲۹ی ئـاوریلی ۱۹۹۷ لـە شـاری لۆکزامبۆرگ کۆبوونەوە بۆ هەماهەنگ کردنی سیاسەتێکی یەکسان لە بەرامبەر ئێـران دا و لەو کۆبوونەوەیەدا ئەم بڕیارانە دران:

[113] ڕۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی حدکا، ژمارە ۲۳۲ لاپەرە ۵ ، ۶ ، سەرچاوەی پێشووی سەفەری پێنگەرانەوە لاپەرە ۱٤۲

[114] ڕۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی حدکا، ژمارە ۳۲۲ لاپەرە ٦

١ـ پەسندی ئەوە کە لە بارو دۆخی ئێستادا هیچ بنەمایەك بەدی ناکرێ بۆ دیالۆگی ڕەخنەگرانە لە نێوان یەکیەتی ئەورووپا و ئێران دا .

٢ـ ڕاگرتنی چاوپێکەوتنی ڕەسمی لە ئاستی وەزیران دا لە نێوان یەکیەتیی ئەورووپا و ئێران دا.

٣ـ پشتگیریی سیاسەتی ئێستای یەکیەتیی ئەورووپا لە بابەتی پێ نەفرۆشتنی چەك بە ئێران.

٤ـ یارمەتی کردن لە گەڵ یەکتر بە مەبەستی نەدانی ویزا بەو ئێرانی یانەی کە کاری سیخورو ئەمنیەتی دەکەن.

٥ـ باس و راوێژ و هاوکاری لەگەڵ یەکتر لە بارەی دەرکردنی مەئموورە ئیتلاعاتی یەکانی ئێران لە وڵاتانی ئەندامی یەکیەتیی ئەورووپا.[١١٥]

## ج) ئامریکا پشتگیریی بڕیاری میکۆنووس دەکا

دەوڵەتی ئامریکا ڕەزامەندی خۆی سەبارەت بە حوکمی دادگای میکۆنووس دەربڕی. "نیکۆلاس برنز" وتە بێژی وەزارەتی دەرەوەی ئامریکا رۆژێك دوای دەرچوونی حوکمەکە گووتی کە ئێمە خۆشحاڵین بە هەڵوێستی ئاڵمان و یەکیەتیی ئەورووپا سەبارەت بە وەلانانی سیاسەتی دیالۆکی ڕەخنە گرانەیان لەگەڵ ئێران و دەرکردنی چوار دیپلۆماتەکەی لە ئاڵمان. هیوادارین یەکیەتیی ئەورووپا بە گرتنە پێشی سیاسەتێکی قاتع بۆ مەهارکردنی ئێران لە ئاژاوە نانەوە و تێکدانی هێمنی لە ناوچەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و کوشتنی ئەفرادی ئۆپۆزسیونی ئێرانی لە دەرەوەی وڵات لەگەڵ ئەمریکا بکەوێ.

[١١٥] رۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی حدکا، ژمارە ٢٤٥ لاپەرە ٣٦، سەلامی عەزیزی، سەفەری بێگەڕانەوە لاپەرە ١٩٨

**بەندی دووهەم:**

## پێشوازیو پشتیوانیی حیزبو ڕێکخراو کۆڕو کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان

## لە بڕیاری دادگای میکۆنوس

(... دەرچوونی ئەو بڕیارە مێژووییە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ هەموو هێزە پێشکەوتن خوازەکان و عالقانی کۆماری ئیسلامی چونکە یەکەم جارە هەیئەتی دەسەلاتداری کۆماری ئیسلامی بە گشتی لە دادگایەکی سەربەخۆدا وەك داڕێژەری گەلاڵەی تیرۆر و وەك حکومەتێکی تیرۆریست بە ئاشکرا مەحکووم دەکرێ ... ئەو هەولانە دەبێ زەمینەی پێکهاتنی دادگایەکی نێو نەتەوەیی دژی ڕژێم پێك بێنن ...)

**کۆمیتەی بەربەرەکانی لەگەڵ تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامی ئێران**

**١١ی ئاوریلی ١٩٩٧**

بە سەرنج دان بە بڕیاری دادگای میکۆنوس، دەوڵەتە ئەورووپایی یەکان و لەسەرووی ئەواندا دەوڵەتی ئالمان، ناتوانێ لەبەرامبەر ویستی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانیدا بێدەنگ دابنیشن و هەروەك پێشوو لە ژێر پەردەی "دیالۆگی ڕەخنەگرانە"دا کۆماری ئیسلامی تەبرەئە بکەن .

**ڕێکخراوی یەکیەتیی فیدائیانی گەلی ئێران**

**١٠ی ئاوریلی ١٩٩٧**

(... خوازیاری هەنگاو نانی خێرای شورای ئەمنیەتی نەتەوەیەکگرتووەکانە بۆ موحاکمەی نێو نەتەوەی بەرێوەبەرانی ئەسلی جینایەتی ڕێستورانی میکۆنووس، واتە "خامنەای"،"رفسنجانی"،"ولایتی"و "فلاحیان")

**ڕێکخراوی چریکە فیدایی یەکانی گەلی ئێران**

**١٠ی ئاوریلی ١٩٩٧**

(... گەرچی حیسێبی خەڵكی ئێران لە ڕێبەرانی ملهوڕی كۆماری ئیسلامی بە تەواوی جیاوازە بەڵام بەو هۆیەوە كە دادگای بێرلین قامكی تاوانی بۆ لای چەند كەس لـە ناسـراو ترینی ئەوان ڕاداشتووە ئابڕوو چونێكی بێ وێنە لە دنیای میللـەتان دا پێـك هـاتووە كـە ئیدی بەهات و هاواری سیاسی بێ‌ئێوەرۆك دا ناپۆشرێ.)

دەبیرخانەی حیزبی میللەتی ئێران

١١ی ئاوریلی ١٩٩٧

(... كاتی ئەوەهاتووە كە هێزەكانی ئۆپۆزیسیۆنی پێشكەوتنخواز لە پێناو پێك هاتنی دادگایەكی نێونەتەوەیی وەك دادگای موحاكمە كردنی سەرانی نازی، كە لەودا یەكەیەكەی بەرێوەبەرانی كۆماری ئیسلامی موحاكمە بكرێن ... دەبێ بە وەرێ خستنی خەباتێكی تـەبلیغاتی نێونەتـەوەیی بڕیـاری دادگـای میكۆنـووس بكرێتـە پێوانـەی دیـاری كرانـی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتانی ئەورووپایی بەرامبەر بە دەوڵەتی ئێران ...)

ئەنجوومەنی دیفاع لە زیندانی یە سیاسی وعەقیدەتی یەكان

پاریس ١٠ی ئاوریلی ١٩٩٧

(... وێڕای ڕەزامەندی دەربڕین لە بڕیاری دادگای بێرلین هیوادارە كـە دیموكراسـی یـە ئەورووپایی یەكان هەڵوێستی سیاسی پێویسـت و گونجـا و لەگـەڵ گرینگـی بڕیـاری ئـەم دادگایە بگرن).

بزووتنەوەی خۆڕاگریی نەتەوەی ئێران

١٩٩٧

(... ئەمرۆ بۆیەكەم جار لە مێژووی هاوچەرخ دا دادگایەكی سەربەخۆ ڕێبەرانی پلـەی یەكەمی وڵاتێكی دەرەوەیی سەبارەت بەرێوەبردنی تیرۆر و جینایەت مەحكووم كردوە...)

ڕێكخراوی لایەنگرانی مافی مرۆڤ و ئازادی یە بنەڕەتی یەكان لە ئێران دا.

(... بڕیاری دادگای بێرلین لەسەر بیرو ڕای گشتیی جیهان و دەوڵەتە ڕۆژئاوایی یەکان لەوبارەوە گرینگە .... دوومانگ لەمەوبەر ۱۰سەناتۆری گرینگی ئەمریکایی بۆ سەرکۆماری ئەمریکایان نوسی، حیسێبی میللەتی ئێران لە ڕێژیمی تاران جیا بکرێتەوە).

**بنیاتی ئازادەگانی ئێران لە واشینگتون**

**۱۹۹۷**

(... ئیمە خوازیاری ئاشکرا کردنی ناوی تیرۆریستەکان و جاسوسەکانی ڕژێمی ئیسلامی و گیران و موحاکەمە کردنیانین ...)

**شوورای ناوەندی یەکیەتیی فیدائیانی کۆمۆنیست**

**۱۹۹۷**

بڕیاری مێژووی دادگای بێرلین بەڵگەی مەحکوم بوونی کۆماری ئیسلامی یە هەتا دەگاتە پایە بەرزترین کاربەدەستان و بەرێوەبەرانی ... ئێستا بۆیەکەم جارە خوێنی خەبات گێڕان بە فیرۆ ناچێ و کۆماری ئیسلامی بەمەبەستە چەپەڵەکانی یەوە لەبەرچاوی جیهانیان دا خۆی دەرخستوە.

**(ڕێکخراوی مەشروتە خوازان)**

(... لەگەڵ دەرچوونی ئەو بڕیارە، کۆڕو کۆمەڵە نێونەتەوەیی یەکان لەوە زیاتر ناتوانن لە بەرامبەر بارو دۆخی ئێران دا چاویان بنوقێنن ...)

**(بزووتنەوەی نەتەوایەتی ئێران)**

(... بۆ دنیا دەرکەوت کە ئەم ڕێژیمە نەتەوەیە خەڵك دەیهەوێ و نە نوێنەری ئەوانە، بەڵکوو بەدەست کۆمەڵێك خائین و جنایەتکارەوەیە و هیچ مەشرووعییەتیان نییە).

**کۆمەڵە ئیسلامی یە ئێرانی یەکان**

(... بۆ یەکەم جار لە مێژووی پێوەندی یە نێونەتەوەیی یەکان، پلە بەرزترین کار بەدەستانی دەوڵەتێك و حکوومەتی ولاتێك وەك گەلاڵە دارێژی تیرۆر و جنایەت، لە دادگای ولاتێکی دیکەدا دەناسرێن).

**هەولدەرانی کۆمەلگای کراوە**

(... چاوەروانی دەکا کە هەموو دەوڵەتانی جیهان پشتیوانیی لە حوکمی دادستانەکانی بێرلین بکەن و پشتیوانی لە میللەتی ستەم دیدەی ئێران بکەن و رێژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران تەحریم بکەن تا لە جیهان دا تاق بکرێتەوە ...)

**سازمانی خەباتی نەتەوایەتی و ئیسلامی کوردستانی ئێران**

**١١ی ئاوریلی ١٩٩٧**

# رای کەسایەتییە جۆراو جۆرەکان لەسەر بڕیاری دادگای میکۆنووس

(... دەوڵەتێك کە لەلایەن دادگاکان و بە پێی ڕاپۆرتی دەزگاکانی یاسادانان لە وڵاتانی جۆراوجۆردا ۳ سفەتی پێ دراوە "خائین بە بەرژەوەندی یەکانی ئێران، فاسد، تیرۆریست" لەم دنیادا ئەگەر ئەم رۆژئاوایە توانی بڵێ کە وەها دەوڵەتێك دەتوانێ دەوڵەتێکی نەتەوەیی بێ. و میللەتێك دەوڵەتێك دێنێتە سەرکار هەم خائین بێ، هەم فاسد بێ و هەم تیرۆریست؟ ...)

**دکتۆر ابوالحسن بنی صدر یەکەم سەرکۆماری ئێران.**

(... دەرکەوت کە ئەمانە هەموو تاوانبارەکان نین و تەنیا چەند کەسێکن لە ئینسانکوژەکان).

(... هەر حوکم دانی ئەمانە بەس نەبوو و ئێمە دەبوایە لە هۆیە ئەسڵی یەکان و هاندەری ئەسڵی پشت پەردەی ئەم ڕووداوە و ئەوەکە بۆچی ئەم کەسانە حوکم دراون بکۆڵینەوە).

**پرویز دستمالچی نووسەر و یەکێك لەو کەسانە کە لە ڕووداوی میکۆنووس دا بە سلامەتی دەرچوو.**

(... لە بڕگەیەکی قەزاوەتەکەدا ڕاگەیاندراوە کە دەستوەردەرانی تیرۆرەکە ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامین ... بە سەرنج دان بەوە کە دادگوستەری ئاڵمان بەرپرسایەتیی جەزایی ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی لە خوڵقانی ئەو جینایەتەدا بۆ ڕوون بۆتەوە. بەو پێ یە دەتوانێ وەك (بنەماڵەی قوربانیان) زەرەر وێکەوتوو لە جینایەت دژی کۆماری ئیسلامی داخوازی یەکان لە دادگوستەریی ئاڵمان دا بێننە گۆڕ و داوای خەسارەت بکەن).

**دکتۆر "عبدالکریم لاهیجی" حوقوقزانی ئێرانی دانیشتووی فەرانسە.**

(... بڕیاری دادگای میکۆنووس ۱۸ ساڵ جینایەت و کارەساتی ڕژێمی سەرەڕۆی ئێرانی لە قاودا ...)

**" امیر انتظام " ڕۆژنامەنووس و کۆنترین زیندانیی سیاسی لە حکومەتی ئیسلامیدا.**

(... ئەمریکاو ئەورووپا دەبێ سیاسەتیان بەرامبەر ئێران لێك نزیك بکەنەوە)

**"بهمن نیرومند"**

(... دەبێ بڵێم کە ئەوە ئاڵوگۆڕێکی گەورەی نێو نەتەوەیی یە کە وڵاتێك بەشێوەیەکی ڕەسمی لە دادگای وڵاتێکی دیکەدا بە تاوانی کردەوەی تیرۆریستی موحاکمە دەکرێ. ئەوە بۆخۆی زۆر زۆر گرینگە ...)

**"منصور فرهنگ"**

(... سەبارەت بە ئاکامەکانی دادگای ئاڵمان کە باس لە تیرۆری ٤ نارازیی لە ساڵی ۱۹۹۲دا بە دەستووری ڕێبەرانی ئێران دەکا. دەڵێ: ئێستا ئەورووپایی یەکان دەبێ ئاگا ببنەوە و نێوەرۆکی ڕاستەقینەی ڕێژیمی ئێران بناسن ...)

**"اسد همایون"**

بە بڕوای من ئەم بڕیارە قەزایی یە زەنگی مەترسیی بۆ کۆماری ئیسلامی زرینگاندوەتەوەکە ئەوە سەرەتای کارەو هێشتا ئەوەڵی شەوەوشەویش درێژە.....

**علیرچا نوری زادە نووسەر و ڕۆژنامەنووس**

**۱۱ی ئاوریلی ۱۹۹۷**

# گوڵبژێرێك لە پەیامی ڕێكخراوە سیاسییەكان

**پەیامی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی كوردستان**

(... حكومەتی هەرێمی كوردستان لە كاتێك دا ئیدانەی ئەوتاوانە و هەموو جۆرە تیرۆرێك دەكا، داوكاریشە تاوانباران بە سزایی یاسایی بگەیەنن ...)

**پەیامی پارتی دیموكراتی كوردستانی عێراق:**

(... تاوانەكە لە هەموو نەتەوەی كوردە، نەك هەر جەماوەری كوردستانی ئێران و رابەرایەتیی حیزبە تێكۆشەرەكەتان، چاكترین بەلگەیە بۆ بێ هێزی و بێ توانایی تاوانباران و ڕێژیمەكەیان ...)

**پەیامی یەكیەتیی نیشتمانی كوردستان**

(... دڵنیاین لەوە ئەم جۆرە كارە دڕندانەیە خەباتی گەلی كورد ڕاناگرێ ... لە پێناوی مافی خۆ بڕیاردان و ئازادی دیوكراسی دا و دژی پێشێل كردنی مافی مرۆڤ و دیكتاتۆری و كۆنەپەرستی ...)

**پەیامی كۆمیتەی سەركردایەتیی شیوعیە كوردستانیەكان ـ راستەقینە**

(... پیرۆزبایی ئەو سەركەوتنە سیاسی یە لە گیانی پاكی دكتۆر "سادق شرفكندی" ...

ئەو خاڵانەی خوارەوە ... ١ـ فایلی تیرۆركردنی دكتۆر (قاسملو) بێتەوە سەر مێزی لێكۆڵینەوەی نەتەوە یەكگرتووەكان و لیژنەی مافی مرۆڤی جیهانی ...

**بەڕێزی سیاسی پارتی كاری سەربەخۆیی كوردستان**

(... بێگومان ئاشكرا بوونی چۆنیەتیی ئەنجامدانی ئەو تاوانە گەورەیە زیاتر ڕووخساری دژێوی كۆماری ئیسلامی ئێران چ لە ناوەوەی ئێران، چ لە دەرەوەی بەدەردەخات و زیاتر گۆشەگیری دەكات...[116])

[116] ڕۆژنامەی كوردستان ئۆرگانی حدكا، ژمارە ٢٤٤ لاپەرە ١٥ ، ٢١

## بەشی حەوتەم:
## هەڵوێستی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی سەبارەت بە تیرۆری سیاسی

**بەندی یەکەم**

ا) تێڕوانینی چەند کەسایەتیەکی خاوەن ڕا لەسەر تیرۆریزمی دەوڵەتی

ڕۆژی ۱۷ی ئاوریلی ۱۹۷۷ کۆمیتەی فەرعی ڕۆژهەلاتی نزیك و خوارووی ئاسیا کە یەکێك لە کۆمیتەکانی سەربە کۆمیتەی سەنای ئامریکایە، کۆبوونەوەیەکی "گوێ گرتن لە بۆچوونەکان" پێك هێنا. سەبارەت بە کردەوەکانی ئێران ژمارەیەك لە خاوەن نەزەران و پسپۆرانی شارەزا بە مەسایلی یاسای و سیاسی قسەیان کرد. لێرە چەند نموونەیەك باس دەکەین.

سناتۆر "سام براون بك" گوتی:" لە ساڵەکانی دوای شۆڕشی ئیسلامی دا، ئێران بووە بە وڵاتێکی شەڕخواز نە حەواوە، لەسەر ئەوە سوورە کە ئیسلامی تایبەتی خۆی بۆ دەرەوە بنێرێ بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی لە پێك هێنانی ترس و تیرۆر هەم لەنێوخۆی وڵات و هەم لە دەرەوەی وڵات دا کەڵك وەرگرێ. وڵاتێکی سەرەڕۆیە کەوا دێتە بەرچاو لەگەڵ عەقڵ و مەنتیق هەڵ ناکا ... ."

سناتۆر "داماتو" گوتی: "لەم دواییانەدا دادگایەکی ئاڵمان ڕوونی کردەوە کە ئەو ٤ نەفەرە کوردەی (لە ڕێستۆرانی میکۆنۆوس تیرۆر کران) بە دەستوری سەرۆك کۆماری ئێران و ڕێبەری مەزهەبیی ئێران کوژراون. ئێمە پێشنیار ناکەین کە ئەوان بۆمباران بکەین. ئێمە پێشنیار دەکەین با پێش ئەو پووڵە بگرێ کە ئیمکانی بۆمبارانی خەڵکی تر بۆئەوان پێك دێنێ."

سناتۆر "بریدولش" گوتی: "... ئێران لە کردەوە تیرۆریستی یەکان هەر لە خوارووی ئەمریکاوە هەتا ڕۆژهەلاتی دوور پشتیوانی دەکا، ...نە سنوور دەناسێ و نە تەمەن و نە

جنسییەت و نەمەزهەب و میللەت. تەنانەت خەڵکی ئێرانیش لە توند و تیژی لە ئەمان دا نین ... حەوتوویەك لەمەوبەر بوو کە دادگایەکی ئاڵمان، ئاشکرای کرد. کە تیرۆری چوار کوردی ئێرانی لە رێستورانی میکۆنووس لە بەرلین بە دەستووری پلە بەرزترین بەرپرسانی دەوڵەتی ئێران ئەنجام دراوە ئەم قەتڵە نموونەیەکی بەرینتر لەو تیرۆرانەی دەوڵەت بوو کە ساڵی ۱۹۹۰ و تا ئێستا نزیك بە ۵۰کەسی لە بەین بردوە."

سناتۆر "جمیز ولس" سەرۆکی پێشووی رێکخراوی مەرکەزی ئیتلاعاتی ئەمریکا (سیا) گوتی: " ...... ئەو شێوەیە کە ژمارەیەك لە هاوکارە ئوروپاییەکانی ئێمە جارجار دەیگرنەوە پێش واتە ئەوە کە رەفسنجانی یەکی (معتدل) و میانەرەو هەیە و هەندێك ناخوێندی توند رەو، بەبروای من ئەمە قسەیەکی پوچ و بێ مانایە. من پێم وایە ئەم هەڵوێستە بەو بڕیارەی دادگای میکۆنووس دەری کرد بەتەواوەتی زەبری وێ کەوت .... ئەمریکا هیچ رێگەیەکی نیە جگە لەوەی پەنا بەرێتە بەر دژ کردەوەیەکی توند و لێبراوانە، ئێمە زل هێزی ئەم دنیایەین وهیچ دەوڵەتێك لە ئێران نابێ بەدوای کردەوەیەکی لەم چەشنە دژی ئەمریکا ، بتوانێ خۆی دەرباز بکا."

"وارن کریستوفر" وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکا سەبارەت بە تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامی رادەیگەیەنێ ".....گەلێك بەڵگە لەبەردەست دان کە ئێران بە پشت بەستن بە تیرۆریزم تێ دەکۆشێ تەگەرە بخاتە بەر رەوتی ئاشتی رۆژهەڵاتی نێوەراست."

خوالێخۆش بوو"یاسر عەرەفات سەرۆکی پێشووی حکوومەتی خودموختاری فەلەستین لە غەزەنەوکات گوتی: "تاقمێکی نهێنی فەلەستین نەخشەی کوشتنی ئەویان دوای فتوایەك کە لە ئێران دەرچووە دارشتووە."

ئاغای "داونێر" وەزیری کاروباری دەرەوەی ئوسترالیا لە رۆژنامەی سیدنی مونیتگ هیرالدی ـــ ئوسترالیادا گوتی: "حوکمی دادگا ئەوە دەردەخا کە پایە بەرزترین

کاربەدەستانی ئێران دەستیان لەو تیرۆرەدا هەبوو. ئوستڕالیا ئەو بەشە لە حوکمەکەی دادگا زیاتر و وردتر دەداتە بەر سەرنج، ئوستڕالیا دژی تیرۆریزمە و مەحکوومی دەکا.

ب) بەدوای رووداوی یازدەی سێپتامبر سەبارەت بە تیرۆریزمی نێو دەوڵەتی زۆر کۆڕ و کۆبوونەوە گیران، لە کتێبی دوای هەژانی دونیا چەند کەسایەتیی خاوەن نەزەر بەجۆرە لە سەر تیرۆریزم دوان.

فەیلەسووفی فەرانسی "ژاك دریدا" : چۆن دەکرێ بەرەنگاری ئەم تۆڕە ببینەوە؟ ئایا بە هێزی سەربازی ئەم کارە دەکرێ ؟ وەڵام : رەنگبێ کردەوەیەکی تیرۆریستی لەو بابەتە پێویستی بە وەڵامێکی پۆلیسی و سەربازی هەبێ بەڵام وەڵامێکی وەها، ئەگەر نەتوانێ گۆڕانێك لە سیاسەتی لە نێوبردنی زەمینەی تیرۆردا دروست بکا، شتێکی ئەوتۆ نیە، بە پێچەوانەوە دەتوانین دڵنیا بین لەوەی کە ئەم کردەوانە دووبارە دەبنەوە بۆیە دەبوایە لە نێو رای گشتی دا هیچ شوێنێك بۆ ئەنجامدەرانی ئەم تاوانە نەهێڵدرێتەوە.[117]

"تاهیر بن جەلون" موعتەبەرترین نوێنەری کۆمەڵی ئەدەبیی مەراکشی یە کە دەڵێ: بۆ ئێوە ئیسلام چیە؟ من پڕوپاگەندە بۆ گەورەیی ئیسلام ناکەم، من دەمهەوێ دیمەنێکی راستەقینە بخەمە پێش چاو و باسی ئەو دیمەنە بکەم، من دەمهەوێ روونی بکەمەوە کە ئیسلام ئایینێکی گەنجە کە تازە پێی ناوەتە (١٥٠٠) ساڵەیی یەوە و لە ئاستی دونیادا لە پەرەسەندندایە، ئایینێك کە ئەخۆشیشی هەن، توندوتیژی، دەمارگیری و تەفسیری هەڵە، من دەری‌دەخەم کە جیهاد وەکوو (فتوا بۆ سەردەمی ئەمڕۆ شتێکی دواکەوتووانە و بێ‌یاسایی یە).[118]

دوکتور رۆف کە یەکێك لە روخسارە بەرجەستەکانی ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئەمریکایە دەڵێ: ئەگەر سیاسەتی خاوەند جێی سیاسەتی گەلان بگرێتەوە بەردەوام هێندێك کەسی

---

[117] ژاك دریدا، وەرگێرانی رێبوار کەریم وەلی، دوای هەژانی دونیا (بنەمێك لە ژێر ناونیشانی:کەس بێ‌گوناح نیە)ل٤٢

[118] ژاك دریدا، وەرگێرانی رێبوار کەریم وەلی، دوای هەژانی دونیا (بابەتێك لە ژێر ناونیشانی‌تیرۆریزم نوێنەرایەتیی هیچ شارستانیەتێك ناکا)ل٤٧

وشکە پیرۆز پەیدا دەبن کە بە دەمارگیری خۆیان تاوانی وەها شەیتانی ئەنجام دەدەن کە تەنها مرۆڤ لە دەستی دێ ئەنجامیان بدا. ئەوان هەست بە هیچ جۆرە گوناح یان پەشیمانی یەك ناکەن، بگرە تەنها پاساوی ئایینی یان دەبێ، بەم شێوەیە بڕیارە ئەخلاقی یەکان ئاوەژوو دەبنەوە، ئەزموونەکانی ئەم دوایی یە دەبێتە هۆی ئەوەی بیر لەوە بکەمەوە کە بیرۆکەی گوناهی ئەزەلی شتێکی راستە.[119]

سەرۆك قادر نووسەر و رۆژنامەوان دەڵێ ئەمریکا خۆی دەڵێ هەدەف تەنیا گرتنی "بن لادن" نیە، ئامانجی رۆژئاوا لێدانی توندڕەویی سیاسی یە کە خۆی لە پەنای ئایینی ئیسلام شاردوەتەوە، ئەم توندڕەوی یە تەنیا رێکخراوە توندوتیژەکان ناگرێتەوە بەڵکوو پەل و بۆ رژێمە دیکتاتۆرەکانیش داوێ.[120]

## بەندی دووهەم

## پرنسیپەکانی یاسای گشتی نێونەتەوەیی

له جارنامەی مافی مرۆڤ دا کوشتنی سیاسی یان تیرۆری سیاسی بە چ شێوەیەك هاتووە؟

لە وڵام دا دەڵێن تیرۆری سیاسی لەگەڵ تیرۆری غەیرە سیاسی هیچ جیاوازی یەکیان نی یە. ئەو کەسانەی سەبارەت بە پاراستنی گیانیان، بە مەبەستی پاراستنی ئابروو یان ئازادی بەیان و عقیدە و کەرامەتیان ناچارن نیشتمان بە جێ بێڵن، لە دەرەوەی وڵاتی خۆشیان دا لە ئەمان دا نین و کۆماری ئیسلامی لەو دیوی سنوورەکانی خۆشی دا یاسا پێشێل دەکا و شوێنیان دەکەوێ و تیرۆر بۆ وڵاتانی دیکەش دەنێرێ، لێرەدایە کە حوکمی

---

[119] ژاك دریدا، وەرگێڕانی رێبوار کەریم وەلی، دوای هەژانی دونیا (بابەتێك لە ژێر ناوونیشانی:تیرۆر ژیانی مرۆڤ هیچ بەهایەکی نیە)ل٨٩

[120] ژاك دریدا، وەرگێڕانی رێبوار کەریم وەلی، دوای هەژانی دونیا (بابەتێك لە ژێر ناوونیشانی:دونیا بەرەو گۆڕانێکی گەورەیە با چاومان کراوە بێ)ل٩٩

دادگای میکۆنوس لە بارەی یاساییەوە ئامرازێکی قانوونی دەداتە دەست. یەکەم دەوڵەتان بەرگری بکەن لە پێشێلکاری یەکانی یاسایی لە لایەن کۆماری ئیسلامی یەوە.

دووهەم: ماف دەداتە ئەو کەسانە کە خاوەن سکاڵان کە دەعوا بەرزبکەنەوە بۆ دادگای نێو نەتەوەیی داوای قەرەبوو کردنەوەی زیانە ماددی و مەعنەوی یەکان بکەنەوە .

سەرۆکی دادگای بێرلین بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکا کە ئەو قەتلە، قەتلێکی سیاسی یە، هیچ ئەنگیزەی مەزهەبی تێدانی یە. لە بەرگەیەکی ئیدعا نامەکەدا گوتراوە کە دەستوور دەرانی تیرۆرەکە، رێبەرانی کۆماری ئیسلامین، لێرەدا قەزییەکە دوولایەنی هەیە. لایەنێکی پێوەندی بە دەوڵەتی ئاڵمانەوە هەیە. ئایا دەوڵەتی ئاڵمان بە پێی ئەو بریارە دەیهەوێ دژی ئەو رێبەرانە لە وەزارەتی دادی ئاڵمان دا کردەوەی قەزایی بەرێوە بچێ یان نا؟ لێرەدا لە نێوان یاسای جەزایی نێوخۆیی و یاسای نێونەتەوەیی کێشەکێش دروست دەبێ لە پێوەندیی لە گەڵ پێوەندییەکانی دیپلۆماتیکی نێوان دەوڵەتەکان...

لایەنەکەی دیکە ئەوەیە کە ئەوکەسانەی زیانیان بەرکەوتووە، بنەماڵەی قوربانیانی جینایەتەکە بە سەرنج دان بەوە کە قەزایی ئاڵمان بەرپرسایەتی جەزایی رێبەرانی کۆماری ئیسلامی لە ئەنجام دانی ئەو جینایەتە، دژی ئەو رێژیمە داخوازی یەکان لە قەزایی ئاڵمان دا بێننە گۆرو داوای خەسارەت بکەن[121].

## جۆرەکانی سزا بە پێی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

بکەری تاوانی نێونەتەوەیی لەهەر حاڵەتێکدا کەسی (حقیقی)یە، چ وەك هاوڵاتییەکی سادە چ وەك کارگوزار یان نوێنەری وڵاتێك، تایبەتمەندی ئەمجۆرە کەسانە لە هەموو بارێکەوە وەك: جنس (نێر و مێ)،تەمەن، پیشە، رەگەز، مەزهەب، زمان، نەتەوە، تایبەتییەتەو هتد...

[121] حقوقی جزای عمومی چاپ هشتم ۱۳۷۶ نویسنده د.هوشنگ شامبیاتی _ رۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی حدکا، ژمارە ۲٤٥ لاپەرە ۱٤

لە (پلە) کەیدا کاریگەر نابێ. لە ئاکامدا کەسانی ئاسایی، نیزامیان، موچە خۆران و پیاوانی میری و مووچەخۆرانی پلە بەرزی وڵات و نیزامیان لە هەر پلەیەك و پایەیەك دابن، بە هۆی کردەوەی تاوانی نێونەتەوەیی چ وەك فەرماندەری یاسایی چ وەك ئەنجام دەرانی فەرمانی پێچەوانەی یاسایی سەرەوە خۆی، لە ئاست کۆمەڵی نێو نەتەوەیی‌داە بەرپرسی بە سزاگەیاندن.

تاوانی نێونەتەوەیی میری بابەتێکی نوێیە لەگەڵاڵەی پێوەندی دار بە بەرپرسایەتی نێونەتەوەیی و وڵاتاندا کە لە ساڵی ١٩٩٦ لە کۆمیسیونی مافەکانی نێونەتەوەیی لە ژێر ناوی "تاوانی نێو نەتەوەیی"دا پێشبینی کراوە.

بە پێی ئەم گەڵاڵەیە کردەوەیەك لە باری نێو نەتوەیی‌یەوە "خلاف" و لەژێر پێنانی دروست بوونی "تعهد" نێو نەتەوەیی لە لایەن وڵاتێکەوە بێت و ئەو پەیمانە "تعهد"ە بە پاراستنی بەرژەوەندی گشتی نێو نەتوەیی ناسراوە (خاڵی ٢ ـ مادەی ١٩)[١٢٢]

## ئایا ئێران بەردەکەوێ؟

دوو جۆر سزا هەیە بۆ ئەو دەوڵەتە کە یاسای گشتیی نێودەوڵەتی پێشێل دەکا.

یەکەم: سزا بەبێ بەکارهێنانی هێزی نیزامی.

دووەم: سزا بەکارهێنانی هێزی نیزامی.

خاڵی یەکەم

ا: سزای مەعنەویە، لەو بارەوە دەکرێ بڵێین کە بوو بە هۆی دەربڕینی نارەزایەتی و خۆپێشاندان و هاروژاندنی بیروڕای گشتیی جیهان و مەحکوم کردنی ئێران و ناسینی بە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی. و ماوەیەکی زۆر لە راگەیاندنە گشتی یەکان و رادیوو تەلەفزیونەکانی بیانی دا لەو پێوەندی یەدا قسە و وتووێژ کران.

122 حقوق بین المللی عمومی چاپ هفتم تهران سال ١٣٨١ نویسنده محمدرضا ضائی بیگدلی

ب: سزای برینی پێوەندی دیپلۆماسی یە، لەوبارەشەوە ئوسترالیاو نیوزلەندا و تێکرا ئورووپا جگە لە ئیتالیا سەفیرەکانیان لە ئێران بانگ کردنەوە و سەفیری ئێرانیشیان لە ولاتی خۆیان دەرکرد.

ج: لە باری سزای مالّی یەوە، یەکیەتی ئورووپا بریاریان دا چەك بە ئێران نەفرۆشن و نەدانی ویزا و پاسپۆرت وچاوپێکەوتنی رەسمی یان راگرت و ئامریکاش داوای کرد کە گەمارۆی ئابووری لە لایەن ئورووپاشەوە تەئید بکرێ.

د: سزای قانوونی ئەو سزایە کە لە لایەن دەولّەتەکان و ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەولّەتی بۆ دەولّەتی سەرپێچی کەر دیاری دەکرێ کە نابێ لەمەو دوا ئەم کارە بکا، لە کاتی دەرچوونی حوکمی دادگای میکۆنوس هەلّوێستی رای گشتی وێرای مەحکووم کردنی ئێران تەئکید لە سەر ئەوە کرایەوە کە نابێ کردەوەی لەو بابەتە لە کۆماری ئیسلامی رووبداتەوە.

ئەمانەی سەرەوە هەموویان سزای یاسایی بوون کە سەبارەت بە ئێران ئەنجام دران بۆ ئەوەی بەلّکو بە خۆیدا بچێتەوە واز لە کردەوەی تیرۆریستی و ئینسان کوژی بێنێ.

خالّی دووەم

ا: رەفتاری پۆلیس ئەم جۆرە سزایەش کە لە پێناوی زامن کردنی و جێبەجێ کردنی قانوونی گشتی نێو دەولّەتانەوە بەرێوەدەچێت، لە کۆن دا زۆر باو بو بەلاّم ئێستا بە بوونی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هێندێك قیودی دەخرێتە بەردەم.

بەلاّم ئێستاش جارجار دەکرێ، چونکە پشت دەبەسترێ بە هێزێکی پۆشتە و پەرداخت زۆرتر پێوەندی هەیە بە ناکۆکی نێوان دەولّەتان.

ب: اختصاص: هەر دەولّەتێك ئەگەر هێرشی بکرێتە سەر. یان گیانی هاولاّتیانی و ئەمن و ئاسایشی ولاّتەکەی تێك بدرێ. بۆی هەیە بە پێی ماددەی ٣٨ لە رێگای دادگای عەدلی نێو نەتەوەیی سکالاّ بەرزبکاتەوە بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش لە رێکخراوی نەتەوە

یەکگرتووەکان. ئەگەر کێشەکە چارە سەر نەبور مافی راستەوخۆی هەیە بۆ دیفاع و بەربەرچ دانەوە. لێرەدا ئەوە دەولەتی ئالمانە کە سەروەری ولاتەکەی لەکەدار کراوە لە ژێر حوکمی ئەودا دەست درێژی دەکرێتە سەر گیانی چەند مرۆڤێك و دەکوژرێن. بەلام قوربانیەکان لە گەلێکی چەوساوە و ژێر دەستن. بۆیە دەسەلاتی سیاسی ولاتان ئامادە نین بەرژەوەندی گشتی خۆیان لە دەست بدەن یان بخەنە مەترسی‌یەوە بۆیە "دەولەتی ئالمان لە پاراگرافی پ ١٥٣ کەلکی وەرگرت"[123] بۆ واز هێنان و بەستنی دۆسیەی میکۆنووس و موحاکەمە نەکردنی سەرانی کۆماری ئیسلامی لە دادگای نێو نەتەوەیی‌دا. لێرەدا جیاوازی یەك هەیە لە نێوان سیاسەت و حوقووقدا، لە مەسایلی قەزایی دا کە دوو مەسەلە وەکوو یەك بن یەك رێگا چارەیان بۆ دیاری دەکرێ. بەلام لە سیاسەتدا پێچەوانەیە، بە گوێرەی هەل و قازانج و بەرژەوەندی یەکان هەلوێست دەگیرێ. دادگای میکۆنوس بە بەلگە سەلماندی کی عامل و دەستووردەرانی تیرۆری میکۆنوس سەرانی کۆماری ئیسلامین. بەلام بیوورای گشتی و ئەنجومەنی ئاسایش لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پێکهێنانی دادگایەکی نێودەولەتی بۆ سەرانی ئێران خۆیان بێ‌دەنگ و بێ‌لایەن راگرت.

لە حالێکدا تیرۆری رەفیق هەریری تاکوئێستا لە دادگایەکی سەلاحییەتداردا بە فەرمی رانەگەیەندراوە کە قاتلەکان و دەستووردەرانی کێن و هێشتا لە حالی شوبهە و گوماندایە بەلام هەولی پێکهێنانی دادگایەکی نێونەتەوەیی بۆ دەدرێ. کە واتە ئەم کەم و کوڕی یە لە سیاسەت و هەلوێستی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان و ئەنجومەنی ئاسایش‌دا بە زەقی دەبینەدرێ. کەواتە پێویستە پێداچوونەوەیەك بەو سیاسەت و بۆچوونانەدا بکرێ بۆ چەسپاندنی ئاسایشی نێونەتەوەیی و رەچاوکردنی مافی ئەو کەس و لایەنانە کە زولمیان لێ‌کراوە و تاوانیان دەرهەق کراوە.

[123] هنوز در برلین قاضی هست لاپەرە ٢١٤

## سەرنجدان بە خاڵێک لە یاسای گشتیی نێونەتەوەیی

"بە پێی بەندی ٣ی ماددەی ١٩ لە قانوونی نێو نەتەوەیی چەند خاڵێک هەن کە پێشێل کردنیان بە جینایەت دادەنرێ کە دەوڵەتەکان راسپێراون بەو تەعهودەی کە نابێ تجاوز بکرێ"[١٢٤] یەکێك لەوخاڵانە پێوەندی بە مەوزوعەکەوە (میکۆنووس) هەیە ئەویش پاراستنی بوون و مەوجودیەتی ئینسانی یە. کەنابێ چەوسانەوە (کۆیلەتی) قەتڵ و عامی بە کۆمەڵ و ئاپارتایدی نەژادی بکرێ و ئەمانە قەدەغە کراون کەچی کاربەدەستانی ئێران، نەك لە ئێران ئەم خاڵەیان نەقس کردوە بەڵکوو لە ئاستی نێو دەوڵەتیش دا تێرۆر دەکا. چونکە فەلسەفە و بۆچوونی ئەو رژیمە ئەوەیە کە بیروبۆچوونی جیاواز قبوڵ ناکات. لە جیاتی زمانی مەنتیق و دیالۆگ کوشتن و لە نێوبردنی کردۆتە پیشە، نموونە ئایەتوڵا خومەینی لە ٧مانگی دوای هاتنە سەرکاری لە نورتی ١٩٧٩دا دەستوری جیهادی لە دژی گەلی کورد دەرکرد. چاوی بەرای نەدا ئازادی گەلی کورد ببینی و خواستەکانی دابین بکا.

### بەندی سێهەم:
### شەرەفکەندی وەك نموونە

سروشتی یە هەر مرۆڤێك لە کۆمەڵگەدا دەوری خۆی دەبینێ. ئەو مرۆڤانەی کە خاوەنی بیرو زانستێکی تایبەتین دەبنە هۆی خوڵقێنەری بەرهەمێك کە سوود بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەگەیەنێ. ئەم کەسانەش کەم نین کە هەرکامێکیان بە گوێرەی زانست و لێهاتوویی خۆیان دەبنە سەمبولی خۆشەویستی و رێزگرتن، بە تایبەت

[124] قانوونی دولی عام قۆناغی سێهەم و چوارەمی یاسا ( لە رووی مەلزەمەکان)

سەرکردەکانی بزووتنەوەی ئازادیخواز و رزگاریخوازی گەلانی ژێردەست . دکتۆر شەرەفکەندی یەکێك لەو سەرکردانە بوو کە لە رۆژهەڵاتی نێوەراست رێبەرایەتی جوڵانەوەیەکی رەوای گەلی کوردی لە بەشی رۆژهەڵاتی کوردستان (کوردستانی ئێران)دا دەکرد. ئەو باشترین جێگر بوو کە پاش تیرۆری رێبەری هەڵکەوتووی کورد دکتۆر "عەبدولرەحمان قاسملوو" ئەو کەلێنەی کە لە جوڵانەوەی کورد لەو بەشە کەوتبوو پڕ بکاتەوە، کۆماری ئیسلامی باسی وتووێژ و دیالۆگی رەخنە گرانەی هێنایە ئاراوە. ئەمەش نەك بۆ چارەسەری کێشەکان و نیەت پاکی بێ بەڵکوو بۆ لەداوخستنی شەرەفکەندی بوو، ئۆپۆزیسیۆنی ئێران وەخۆکەوتن بەڵام ئۆپۆزیسیۆنێکی پەرش و بڵاو، دکتۆر شەرەفکەندی هەوڵی دا ئۆپۆزیسیۆن لە دەوری یەك کۆبکاتەوە و بیکاتە هێزێکی بەتوانا بۆ ئەوەی کۆماری ئیسلامی مل بۆ راستی یەکان رابکێشێ. لەو بوارەش دا شەرەفکەندی دەرری خۆی بینی. بۆیە بوو بە چەقڵی چاوی سەرانی کۆماری ئیسلامی و بریاری کوشتنیان دا سەرئەنجام لە کۆبوونەوەی ئۆپۆزیسیۆن دا و لەسەر مێزی دیالۆگی رەخنەگرانە بە دەستی تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی کوژرا. مەرگی ئەم جۆرە کەسایەتی یانە دوای مردنیش شوێنەواری باش لە دوای خۆیان بەجێ دەهێڵن تیرۆری شەرەفکەندی بوو بە هۆی دروست بوونی شەپۆلێکی بێ وێنە لە هەستی هاودەردی و پشتیوانی کۆمەڵانی بەرینی خەڵك لە سەرانسەری کوردستان و کۆڕو کۆمەڵە ئازادیخوازەکانی دنیا لە گەڵ میللەت و حیزبی شەرەفکەندی. راستە ئەوسەری لە رێگای خەباتی حەق خوازانە دژ بە چەوسانەوە دانا. بەڵام بە خوێنی خۆی کۆماری ئیسلامی ئێرانی لە ئاستی نێونەتەوەیی دا لەسەر کورسی "تاوانباری"دانا. ئەو سەربەرزی و ماف خوازی پێ برا. سەرانی کۆماری ئیسلامی روو زەردی و شەرمەزاری یان پێ برا.

# ئاسەواری دادگای میکۆنوس لە بواری حقووقی و قەزای نێونەتەوەیی‌یەوە

لە ئەسلی ٣٧ی قانوونی ئەساسی جمهوری ئیسلامی ئێران دا هاتووە کە دەڵێ: "اصل برائت است و هیچ کس از نظر قانون مجرم شناخته نمی شود مگر اینکه جرم او دردادگاه صالح ثابت گردد" واتە[125] بەما بێ تاوانی‌یە: هیچ کەس لە روانگەی یاساوە بە تاوانبار ناناسینرێ مەگەر ئەوەکە لە دادگایەکی بڕواپێکراودا تاوانی بسەلمێندرێ.

بەلەبەر چاو گرتنی ئەوراستی یە کە ئەو تاوانبارانەی بەدادگا ناسێندرا بوون لە لێکۆڵینەوەیەکی ورد و درێژخایەن دا مەحکوم بوون لەو موحاکەمەیەدا دەرکەوت کە ئەوانە تەنیا بەرێوەبەری بڕیار بوونە و کەسانی دیکە بڕیاری تیرۆرەکەیان داوە. کەواتە ئەوە کە ئایا دادگای ئاڵمان، دادستانی ئاڵمان و دەوڵەتی ئاڵمان دەیانهەوێ لە باری حقوقی جەزاوە پێوەندی‌یەکە درێژە پێ بدەن یان نا، بۆیە دەبێ بزانین داهاتووی سیاسەتی جەزایی و سیاسەتی دەوڵەتی ئاڵمان چ تواناو دەسەڵاتێکی هەیە. کاتێك قەزایی وڵاتێك، ئەویش وڵاتێکی دیموکراتیك، وڵاتێك کە لەودا دەسەڵاتی قەزا سەربەخۆیە، راست لە پەروەندەیەك دا، لە حوکمێك دا، رادەگەیەنێ کە ئەو تیرۆرە لە لایەن رێبەرانی کۆماری ئیسلامی یەوە، نەك هەر بڕیارەکە دراوە، بەڵکوو هەموو پێداویستی یەکی جێبەجێ کردنی لە ئیختیار مۆرەکانی ناوە، ئیدی ئاڵمان ناتوانێ ئەم مەسەلەیە وەك شتێکی کەهەر نەبووە سەیر بکا. لە راستی‌دا چاو پۆشی لێ بکات. هەروەها درێژە بە پێوەندی سیاسی و ئابووری خۆیان لە گەڵ کۆماری ئیسلامی بدا، کۆماری ئیسلامیش لە ئاستی نێونەتەوەیی دا بەڵگەی یاسایی ئەوتۆی بەدەستەوە نیە کە دیفاعی مەشرووع لە خۆی بکا.

[125] قانون اساسی جمهوری اسلامی ایران مصوب ١٣٥٨ لاپەرە ٣٦

له ئەسڵی ٣٦ی قانونی ئەساسیدا دەڵێ: "حکم به مجازات و اجرای آن باید تنها از طریق دادگا صالح و به موجب قانون باشد"[126]

حوکمی سزادان و بەڕێوەبردنی حوکم تەنیا له ڕێگای دادگایەکی بڕواپێکراودا له ڕێگای یاساوه دەبێ.

به پێی ئەم مادەیه کۆماری ئیسلامی له دادگایەکی سەلاحیەت دار و خاوەن ئەزموونی ٥٠٠ ساڵەی بێرلین و ئەویش له وڵاتێکی موعتەبەری ئەوروپادا وەك ئاڵمان به تاوانباری ئەسڵی دەناسرێ و حوکمی دەردەچێ که تەداخولی وڵاتێکی بیانی کردوه، سەروەری ئەو وڵاتەی لەکەدار کردوه. یاسای نێو دەوڵەتی پێشێل کردوه، تاوانی قەتلی ئەنجام داوه. بەڵام سەیر ئەوەیه ئێران خۆی پێ تاوانبار نیه. له لایەکی دیکەوه له دادگای لاهه سکاڵای له ئەمریکا کردوه به "اتهامی" دەخاڵەت کردن له کاروباری ئێران دا. بەبێ ئەوەی بەڵگەی بەدەستەوه بێ. بەڵام حوکمی دادگای میکۆنووس گرینگی یەکی جیهانی و بایەخێکی قەزایی هەیه، بۆ ئەمریکایەکان بەڵگەیەکی بەهێز و یارمەتی دەرێکی باشه که دادگای لاهه دا بیسەلمێنن که ئەوتاوانەی دەیان دایه پاڵ ئێران درۆنین و بناغه و بنچینەیەکی ڕاستەقینەی وەك حوکمی دادگای ئاڵمانیان هەیه.

حوکمی دادگای میکۆنوس بوویه نوختە وەرچەخانێکی گرینگ بۆ لێکۆڵینەوه له کاربەدەستانی حکوومەتی ئێران که نەتوانن لەوه زیاتر درێژه به تیرۆری نێودەوڵەتی بدەن. له شۆڕشی ئیسلامیی ١٩٧٩ بەولاوه تیرۆریزم (ڕەشەکوژی) بەشێك له سیاسەتی ئێران بووه، هەرچەند لەو ڕێژیمەدا فراکسیونی دژبەر هەیه بەڵام هەموو له سەر ئەوه یەکگرتوون

[126] قانون اساسی جمهوری اسلامی ایران مصرب ١٣٥٨ لاپەرە ٣٦

که کوشتن، بارمتەگرتن و بۆمبا تەقاندنەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجە سیاسی یەکانی رێژیم لە نێو خۆ و دەرەوەی وڵات دا کەرستەی قانوونین، لەو رووەوە ئێران رێژیمێکی تیرۆریستە.[127]

رۆژنامەنووسی ئەمریکایی "ئێدگانۆبالانس" مێژووی تیرۆریسمی ئێرانی لە سالی ١٩٧٩ را هەتا ١٩٩٥ خستۆتە ژێر لێکۆڵینەوە و دەڵا: پێوەندی یەکانی ئێران بریتی یە لە تۆرێکی سەرتاسەری جیهانی لە بالیۆزخانە و دامەزراوە سیاسی یەکان کە پڕن لە جاسووس بۆ پشتیوانی لە تیرۆریستەکان. چەکیان بۆ لە ئەنباردا رادەگرن و نێچیرەکانیان دەخەنە ژێر چاوەدێری پشکنین. لە ژێر پارێزراویی سیاسیی خۆیاندا چەك و تەقەمەنی بە مەرزەکانی نێونەتەوەیی دا دێنن و دەبەن.[128]

رێبەرایەتیی سیاسیی ئێران بڕیاریدا نەك هەر لە بیاری سیاسی لەگەڵ رێبەرایەتیی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران بەربەرەکانی بکا، بەڵکوو ئەو رێبەراتی یە لە نێو بەرێ. کوشتنی سەرۆکی پێشووی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران دوکتور عەبدولڕەحمانی قاسملوو و دوو بارەپێکراوەکەی لە ١٣ ی یولی ١٩٨٩ لە ڤییەن ناکامی ئەو بڕیارەن. ئەو پەتکە سوورەی کە رووداوی ڤییەن و بێرلینی لێك گرێ دەدا زۆر باش دیارە!؟[129]

## حکوومەتی کۆنفێدراسیۆنی سویس بڕیاری گرتنی عەلی فەلاحیانی دا؛

رۆژی ٢٤ی ئاوریلی ١٩٩٠ بەرهەڵستکارێکی سیاسیی ئێرانی، کازمی رەجەوی لە کاتی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە لە شارۆچکەی کۆپی، سەربە دەوڵەتی هەرێمی"ڤۆ" یەکێك لەو ٢٦ دەوڵەتەی کە کۆنفدراسیۆنی سویس پێك دێنن و پێتەختەکەی شاری لۆزانە، لە لایەن ١٣ تیرۆریستەوە پێشی پێدەگیرێ و تیرۆریستەکان ٩ گوللەی لە لەش دەدەن و بۆ تەواو کردنی گوللەیەکی خەلاسی لە پاش ئەستۆی دەدەنو تیرۆری دەکەن.

[127] پیتر پلیچ، ئیسکۆرت بەرەو تاران، وەرگێڕانی حەسەنی ئەیوبزادە، ل ٧٥

[128] هەمان سەرچاوە ، ل ٨٦-٨٤

[129] هەمان سەرچاوە، ل ٨٩

دادوەری لێکۆڵەرەوەی ئەوکات "رۆناڵد شاتلەن" بڕیاری گرتنی ئەم سێزدە کەسەی دەرکرد، بەڵام لە ترسی دژکردەوەی کاربەدەستانی تاران و لە ژێرناوی بەرژەوەندیە دەوڵەتی دا لەوەدوا کەوتنی عەلی فەلاحیان وەک ڕێکخەری ئەم تیرۆرە و دەستنیشانکردنی تیرۆریزمی دەوڵەتیی ئێران خۆی بوارد.

پاش ١٦ ساڵ لەم جینایەتە رۆژنامەی رۆژنامەی فەرانسەیی زمانی "لۆمەتەن" رۆژی یەکشەمە رێکەوتی ٩ی مانگی ئاوریلی ٢٠٠٦ ئەم هەواڵەی ئاشکرا کرد کە ماوەیەک دەبێ کە دادوەر "ژاک ئانتنەن" دادوەری لێکۆڵەرەوەی دەوڵەتی هەرێمی فۆ لە گەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی فیدراڵ لە سەر دۆسیەی رەجەوی لە هاتووچۆدا بوو و لە ئاکام دا رێکەوتی ٢٠ی مانگی مارس نامەیەکی بە مۆری بەتەواوی نهێنی ئاراستەی ئیدارەی عەداڵەتی فیدراڵ کرد. لەم نامەیەدا دادوەر ئانتنەن عەلی فەلاحیان وەزیری پێشووی زانیاری و ئاسایشی ئێران وەک بڕیاردەر و ڕێکخەری کوشتنی کازم رەجەوی دەناسێنی. بە گوێرەی هەمان سەرچاوە ژاک سەردانی وڵاتەکانی ئاڵمان و ئارژانتین کە هەردووکیان بڕیاری گرتنی عەلی فەلاحیانیان لەمەوبەر دەرکردوە راوێژکاری لەگەڵدا کردوون. ئەم سەرچاوە رادەگەیەنێ کە سەرکوت و گوشاری رێژیمی ئاخوندەکان تا ئێستا بۆتە هۆی ٢٥٠ قوربانی بەڵام کاربەدەستانی ئێران هەمیشە رەدی ئەوەیان کردوە کە هاوکاری لەگەڵ بەشی عەداڵەتی ئەو وڵاتانەدا بکەن کە تیرۆر لە سەرخاکیان دا کردوە. بەخۆشییەوە حکوومەتی کۆنفیدراسیۆنی سویس بڕیاری گرتنی عەلی فەلاحیانی دا، ئەمە یەکێک لەو هەنگاوانەیە کە ئیلهام لە بڕیاری دادگای میکۆنوس وەردەگرێ.[١٣٠]

لە مادەی دووهەم لە پرۆژەی بە یاساکردنی تاوانەکانی دژی ئاشتی ئاسایشی مرۆڤایەتیدا هاتووە(ئەنجام دانی چالاکیی رێکخراوی تیرۆریستانە لە وڵاتێکی دیکەدا لە لایەن دەسەڵاتدارانی دەوڵەتەوە یان هاندانی بۆی یان رێگەدان بە دەسەڵاتدارانی دەوڵەت

[130] کوردستان ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران، ژمارە ٤٣٤، ساڵی ١٣٨٤، ل ١

بە چالاکیی رێکخستن بە مەبەستی جێبەجێکردنی کردەوەی تیرۆریستییەکان لە دەوڵەتێکی دیکەدا بە تاوانی نێو دەوڵەتی دادەنرێ).[131]

تیرۆرکردنی کەسایەتیی سیاسیی ناسراو کە کاریگەرییان لەسەر رای گشتی دەبێ بۆ تێکدانی قەوارەی ئەو دەوڵەتە و لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوەی سەقامگیری و ورووژاندنی فەزای ترس تۆقێن لە نێو هاوولاتیاندا بە ئامانجی گۆڕینی سیستمی سیاسی یان رووخاندن و لە ناوبردنی ئەو دەسەڵاتەی تێدایە. ئیدانە کردنی سەرجەم کردەوەکانی تیرۆر چ ئەوەیکە دەوڵەتانی تێوەدەگلێنن یان لە دژی تاك و تاقمە بێ تاوانەکان ئەنجام دەدرێ.[132] بریاری دادگای میکۆنوس ئەو راستی یە دەردەخا کە بە راشکاوانە داوا لە کۆمەڵەی نێو دەوڵەتی بکرێ کە ئێران پابەند بکا بە وەستاندنی سەرجەم کردەوە تیرۆریستی‌یەکان لە ناو خۆ و دەرەوەدا بۆ ئەوانەش کە لە سەری سەلمێندرێراون و دەسەلمێندرێن سزای پێویستی بۆ دابندرێ لە دادگایەکی نێوەنەتەوەیی دا.

[131] د . احمد محمد رفعت ، د . سالح بەکرنەلتەیبار ، وەرگێرانی کوێستان جەمال ، شوێنی چاپ سلێمانی ، چاپخانەی رەنج ، سالی ٢٠٠٢ ، ل٥

[132] هەمان سەرچاوە، ل ٦٧ هەتا ١٧٦.

## شوێنەواری لێکەوتنەوەی دادگای میکۆنووس

دادگای فیدرالی ئارژانتین، رێکەوتی ١٨ی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی بەرامبەر بە ٩ی نوامبری ٢٠٠٦ی زایینی، بڕیاری خۆی لەسەر کارەساتی تیرۆریستیی ناوەندی جولەکەکانی ئارژانتین لە ساڵی ١٩٩٤، دەرکرد. دادگای فیدرالی ئارژانتین، سەرانی رژێمی کۆماری ئیسلامی و باڵوێزخانەی ئەوکاتی ئەو رژێمەی وەکوو رێکخەرو ئۆپەراسیۆنی

تیرۆرو گرووپی بەستراوە بە کۆماری ئیسلامی، واتە حیزبوڵڵای لوبنانیشی وەکوو بەرێوەبەری ئۆپەراسیۆنەکە ناساند. دادگای فیدرالی ئارژانتین، داوای لە پولیسی نێونەتەوەیی (ئینترپۆل)و وڵاتی ئێران کرد کە "ئەکبەر هاشمیی رەفسەنجانی" سەرکۆماری ئەوکاتو سەرۆکی ئێستای کۆڕی دیاریکردنی بەرژەوەندییەکانی نیزام، "عەلی فەلاحیان"، وەزیری ئیتلاعاتی کابینەی رەفسەنجانی، "عەلیئەکبەر ویلایەتی" وەزیری دەرەوەی ئەوکات، "موحسێن رەزایی"، فەرماندەی پێشووی سوپای پاسداران، "ئەحمەد وەحیدی"، فەرماندەی پێشووی هێزی قودسی سوپای پاسداران، "موحسێن رەببانی"، راوێژکاری پێشووی باڵوێزخانەی ئێران لە ئارژانتین، "ئەحمەدرەزا ئەسغەری"، سێهەم سکرتێری پێشووی باڵوێزخانەی ئێران لە ئارژانتینو "هادی سلێمانپوور"، باڵوێزی پێشتری ئێران لە ئارژانتین دەستگیرو راپێچی دادگای ئارژانتین بکرێن."[1]

"لە هەژدەی مانگی ژوئیەی ساڵی ١٩٩٤، تیرۆریستێکی خۆکوژی ئەندامی حیزبوڵڵای لوبنان، بە تەقاندنەوەی ماشینێك لە ساختمانی ئەنجومەنی هاریکاریی ئیسرائیلو ئارژانتین (ئاسیا) لە "بۆینیس ئایرێس) کە ناوەندی کولتووریی جولەکەکانی

نارژانتینە، بووە هۆی کوژرانی ٨٥ کەس‌و بریندابوونی زیاتر لە ٢٠٠ کەسی دیکە. ئەم کردەوە تیرۆریستییە، بە مەزنترین کۆمەڵکوژیی جولەکەکان، لە کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانی بەملاوەو لە دەرەوەی ئیسرائیل، دەژمێردرێ."[٢]

کۆماری ئیسلامی توانیویەتی کارێك بکا کە پەروەندەی چەندین تیرۆر لە ولاتانی ئورووپاییدا بێ‌ناکام دابخرێن‌و هەروەها بە کەڵك وەرگرتن لە نەرمکێشیی ولاتانی ئورووپایی لەگەڵ ئێران کە لە ترسی هەڕەشە جۆراوجۆرەکانی رێژیم‌و هەروەها پاراستنی قازانج‌و بەرژەوەندییە ئابوورییەکان، هێندێ جار سیاسەتی بێدەنگییان هەڵبژاردوە کە بۆتە هۆی ئەوە کۆماری ئیسلامی، پەرە بە کردەوە تیرۆریستییەکانی خۆی بدا. "بۆ نموونە بە پێی نووسراوەکانی "پیتێر پیلتز"، لە رێبەرانی حیزبی سەوزەکانی ئوتریش‌و نووسەری کتێبی "ئیسکۆرت بەرەو تاران" لە رەوتی تیرۆری دوکتور قاسملوو لە ڤیەن، پایتەختی ئوتریش لە ساڵی ١٩٨٩دا، بەڵگەگەلێکی زۆر روون‌و حاشاهەڵنەگر پێش لە چوونە دەرەوەو بە دەربڕینێکی دیکە، ئیسکۆرتی تیرۆریستەکان بەرەو تاران، لە دەست پۆلیسی ئوتریش‌و کۆماندۆکانی دژی تیرۆری ئوتریشدا هەبوون کە نیشاندەری دەست هەبوونی راستەوخۆی رێژیمی دەسەلاتداری ئێران‌و ئێردراوانی هاشمیی رەفسەنجانی، سەرکۆماری ئەوکاتی ئێران لەو تیرۆرەدا بوون."[٣]

بە کورتی: کاتێك دادگای سەربەخۆی بێرلین، بڕیاری مێژوویی خۆی لە ساڵی ١٩٩٧دا دەرکردو زۆربەی ولاتانی ئەندامی یەکیەتیی ئورووپا، باڵوێزخانەکانی خۆیان لە تاران کێشایەوە، لەراستیدا ئەوە ورپاکردنەوەیەك بوو بۆ سیاسەتی تیرۆریستیی رێژیم‌و مایەی هیوای دوژمنانی تیرۆریزم، ئۆپۆزیسیۆنی رێژیم‌و بەتایبەتی نەتەوەی کورد.

شوێنەواری حوکمی دادگای میکۆنووس ئەوە نیشان دەدا، ئەگەر دەوڵەتی ئوتریش رەوتی پەروەندەی تیرۆری دوکتور قاسملوو هاوڕێیانی لە ڤیەن بەو جۆرە بەرەوپێش بردبان

کە راستییەکان روون کرابانەوەو تیرۆریستەکانو رژێمی کۆماری ئیسلامی ریسوا کرابان، رژێمی دەسەڵاتدار بەسەر ئێراندا نەیدەتوانی تیرۆرەکانی دواتر بەرێوە با.

بۆیە پێویستە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لەو بارەوە بەو پەڕی هەستکردن بە بەرپرسایەتی لە دژی رژێمی سەرەڕۆی کۆماری ئیسلامی، هەڵوێستی جیددی بگرێ، چونکە دەبینین ئەمڕۆ تیرۆریزمو بەتایبەت تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامی، رەهەندگەلێکی جیهانیی بەخۆوە گرتوەو بۆتە کێشەیەکی مەترسیداری نێونەتەوەییو سەرەتاکانی سەدەی نوێ، خەبات لەگەڵ تیرۆریزم پێویستیی بە رووبەڕووبوونەوەیەکی رادیکاڵترو بنچینەییتر هەیە کە ئەرکی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی قورستر دەکا.

سەرچاوە:

١ـ "کوردستان" ئۆرگانی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ژمارە ٤٤٩ ـ ساڵی ١٣٨٥

٢ـ هەمان سەرچاوە

٣ـ هەمان سەرچاوە

## دانانی لەوحی رێزلێنان لە شەهیدانی بێرلین

رۆژی شەممە، ٢٨ی خەرمانانی ١٣٨٣ی هەتاوی (١٨ی سێپتامبری ٢٠٠۴ی زایینی) لە دوازدەهەمین ساڵگەڕی تیرۆرکرانی دوکتور شەرەفکەندیو هاوڕێیانی لە شاری بێرلین رێورەسمێك بەرێوەچوو.

لە سەرەتای رێورەسمەکەدا پەیامی خاتوو "مونیکا تیمەن" شارەوانی ناوچەکە خوێندرایەوە. ئەم خانە پێنج مانگ بەر لە ئێستا سەرەڕای هەڕەشەو فشاری زۆری کۆماری ئیسلامی، ئەرکی مافناسیی خۆی بەجێ گەیاندو لەوحی بیرەوەریی قوربانییانی تیرۆری

میکۆنۆوس لە بەرامبەر ئەو ریستورانەدا جێگیر کرد. لە پەیامی خاتوو "تیمەن"دا لەو ڕێوڕەسمەدا هاتبوو: "ئێمە دەمانزانی کە ئەم تیرۆرە بە فەرمانی ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی ئەنجام دراوەو تیرۆریزمی دەوڵەتییە." هەر بۆیە هەوڵمان ئەوە بوو کە ئەو تیرۆرە جارێکی دیکە سوپاسی هەموو ئەو ئاڵمانیو ئێرانییانەی کرد کە بۆ دانانی تابلۆی بیرەوەریی قوربانییانی تیرۆری میکۆنۆوس، هەوڵیان دا.

هەر لەو ڕێوڕەسمەدا خانمی "باربارا لوفپیکر" سکرتێری گشتیی ڕێکخراوی نێونەتەوەیی لێخۆشبوونی ئاڵمان باسی هێندێك لە نموونەی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە لایەن کۆماری ئیسلامییەوە کرد. بەکورتی ئەو پەیامانە، ئەو ڕێزلێنانانە، ئەو بەڵگەنامانە بۆیە دەخرانە ڕوو کە شەهیدەکان بێتاوان بوون. تاوانیان تەنیا مافخوازییەو بەس. بۆیە شیاوی ئەوەن یادیان بکرێتەوە، لەوحەی بیرەوەریو پەیکەریان بۆ دابنرێ تا لە بیر بیرورای گشتیی ئەچنەوەو کۆماری ئیسلامیش بە ڕێژیمێکی خوێنرێژو ماکەی تیرۆریزمی نێونەتەوەیی بۆ جیهان ناسراوەو ئیدی کاتی ئەوە هاتوە بەری پێ بگیردرێو سزای عادیلانەی بۆ دەربکرێ.

## دەرئەنجام

ئەم دادگایە چەند دەرئەنجامێکی لێ کەوتەوە بە کورتی ئاماژە بەچەند خاڵێکی گرینگی دەکەین.

١ـ دادگای میکۆنوس هاوکاری گەلانی ئێران بوو، دەنگی ئیعترازی تێکرای ئازادیخوازانی دنیایە کە لێك گرێ دراوە.

٢ـ ئەو دادگایە لە راستی دا بەمانای تەواو بوونی "قچیە"ی موحاکمەی قاتلانە نەبوو کە لەو دادگایە بوون، ئەو دادگایە لە راستی دا موحاکمەی کۆماری ئیسلامی لە رادەی جیهانی دا بوو.

٣ـ ئەو دادگایە بووەتە بناغەیەکی قورس و قایم بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بکرێ سەرانی ئێران لە دادگایەکی نێو نەتەوەیی دا موحاکمە بکرێن و ببێتە شتێکی جیهانی.

٤ـ پێوەندی لەگەڵ پەروەندەی هێندێك ئەفرادی ئۆپوزیسیونی ئێرانی دایە کە لە ئاڵمان و ئەورووپا تیرۆر کراون. نموونە "دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو لە ١٣ی ژوئیەی١٩٨٩دا لە ڤییەن" لێرەدا لێکۆڵینەوەکان بە ناتەواوی ماونەوە. پەروەندەکان بەستران یان لێ یان ئەکۆڵینەوە حەقیقەتی میکۆنوس ئەوە نیشان دەدا کە ئەو پەروەندانە سەر لە نوێ بکرێنەوە بتوانرێ لە جینایەتەکانی رژێم بکۆڵرێتەوە و تاونباران دادگای بکرێن.

٥ـ ئەو حوکمەی میکۆنوس دەیسەلمێنێ کە لەسەر هیچ موسوڵمانێك نیە بە دەستووری کەسێکی دیکە خەڵك بکوژێ.

٦ـ جیا لە دادگایەکی سەلاحییەتدارو پشت ئەستور بە بەڵگەی بەهێزی قەزایی، کەس ناتوانێ فتوای مەرگ بدا.

٧ـ رێژیمی کۆماری ئیسلامی لە جل و بەرگێکی مەزهەبی دایە بەڵام دەوڵەتێکی جینایەتکار و دژی شەرع و یاسایە.

٨ـ بوونی کۆمیتەیەکی عەمەلیاتی تایبەت کە دژایەتی هەیە لەگەڵ قانوونی ئەساسی ئێران ئەو راستی‌یە دەسەلمێنێ کە سەرانی کۆماری ئیسلامی ئێران ناتوانن لەگەڵ قانوون بن. (٢٤)

٩ـ لە ماوەی نێوان دەست پێ کردنی دادگای میکۆنۆوس تا دەرچوونی حوکم هەلێکی باش و کاتێکی لەبارە بۆ حیزبی دێموکرات و ئۆپۆزیسیونی ئێرانی بوو کە لە دەزگا راگەینە گشتیی یەکانی جیهان بە گشتی و لە ولاتانی ئورووپادا بە تایبەتی تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامی لەقاو بدەن. لەسەپێشێل کردنی ماف و ئازادی‌یەکانی مرۆڤ لە لایەن ئەو رێژیمەوە تەبلیغ بکرێ.

١٠ـ دۆسیەی میکۆنۆوس لە دوو روانگەوە دەبێ سەیر بکرێ لە لایەك بزووتنەوەی رزگاری خوازی گەلێکی چەوساوە و خاوەن رابردوویەکی خوێناوی‌یە کە چەند کەس لە سەرکردەکانی بوونە قوربانی دەستی غەدر و تاوان.

لە لایەکی دیکەوە حکومەتێکی زۆردار و فێڵبازی وەك کۆماری ئیسلامی ئێرانە کە هەموو ئیمکاناتی ئێرانی بۆ پارێزگاری کردن و مانەوەی خۆی و لە نێو بردنی ئازادیخوازان بەکار هێناوە سروشتی‌یە کە لە نێوان ئەو دوو هێزەدا هاوسەنگی لە ئارادا نیە. بەلام عەدالەت، یاسا، دیموکراسی، و دیفاع لە مافی مرۆڤ و حەقانیەت لە پشتی ئەم لایەنە مەزلوومە دەبینرێن و بوونە هۆی ئەوە کە لە دادگای میکۆنۆوس دا یاسا و ماف و عەدالەت سەرکەون بە سەر زۆردار و سەرپێچی کەر.

نموونە: گرینگی حوکمی گرتنی علی فەلاحیان وەزیری ئاسایش (واواك) ئێران زیاتر لەوەدا دەبینرێ کە لە نێوان ئالمان و ئێران دا پێوەندیەکی بازرگانی بەربلاو هەیە و قازانجی ئابووری نەیتوانیوە بەرگری لە بەرێوە چوونی عەدالەت و سەربەخۆیی دەسەلاتی قەزایی ئالمان بکا.

١١ـ ناسەواری حقوقی دادگای میکۆنۆوس ئەوەیە کە توانی لە سەر ئاستی نیشتمانی و نێو دەوڵەتی ڕەوشێك بێنێتە کایەوە کە دەرفەت بۆ تاوانبار نەمێنێ لە دەست دادگا را بکا یان خۆی بە دورو بگرێت و شوێنە ونکە بکا. جا ئەو تاونبارە لە هەرە پلەیەکی بەرزی حوکمی دابێ. گرینگ ئەوەیە تاوان روون بێتەوە تاونباری سەرەکی بناسرێ. بەرگری بکرێ لە ئەنجام دانی تاوانی تر.

١٢ـ دادگا نێودەوڵەتیەکانی دوای شەڕی دووهەمی جیهانی و دوای نەوەدەکان ئەگەر بەراوردی کەین، وەکوو نوورمبێرگ، توکیۆ، یوگسلاوی و رواندا. کە هەریەکەیان بە بڕیارێکو لە هەڵوەمەرجێکی نێودەوڵەتی جیاواز لە دایك بوونە، هەموو ئەمانە و گەلێك کێشەیتر لەوانە دۆسەی میکۆنۆوس دەکری بچێتە دوو توێی توێژینەوەی زانستی لە بواری یاسایی‌یەوە.

١٣ـ پێویستە لە سەر ئەندامانی حیزبی دێمۆکرات و هەموو کوردەکانی دەرەوە خۆپێشاندانی هێمنانە بکەن بۆ گواستنەوەی دۆسیەی تاوانبارانی هەڵاتوو بۆ دادگایەکی نێو دەوڵەتی.

١٤ـ داواکردن لە ڕێکخراوی ئەنترناسیۆنال بۆ جەختکردن لە سەر وڵاتی ئاڵمان بە مەبەستی گواستنەوەی کێشەکە بۆ کێشەیەکی نێودەوڵەتی.

١٥ـ پێشکەش کردنی ئەو بەڵگانەی دژی فەلاحیان و تۆمەتبارانیتر هەیە بۆ لێژنەی مافی مرۆڤ لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

١٦ـ لە لایەن نوێنەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران سکالا بەرزبکرێتەوە بۆ دادگای عەدلی نێودەوڵەتی.

١٧ پێشکەشکردنی یادداشتێك بۆ لێژنەی نەهێشتنی تیرۆر لە نەتەوە یەکگرتووەکان لەو پێوەندییەدا.

▲ دوکتور قاسملو ـ لوقمان میهفەر
کۆنگرەی ۷ (۱۳٦٤) ـ کانی‌میجر

▼ لە راستەوە: مامەقالە دەباغی، لوقمان میهفەر، دوکتور سادق، ئەبووبەکر قەدی‌کورت، قادرئاغای چوارگای، منداڵەکەش قادر میهفەرە ـ نێنزێ (۱۳۷۰)

دوکتور سادق شەرەفکەندی

دوکتور سادق شەرەفکەندیو کاک مستەفا هیجری

ساڵی ١٣٧١ ـ چەند مانگ پێش شەهیدبوونی کاک دوکتور سەعید

دوکتور سادق له کۆبوونهوهی ئهنتێرناسیۆنالی سۆسیالیست (۱۳۷۱)

پەردەلادان لەسەر تابلۆی یەدەوەریی شەهیدانی بێرلین ـ ئاڵمان، ٢٠ی ئاوریلی ٢٠٠٤

An diesem Ort im ehemaligen Restaurant Mykonos
wurden am 17. September 1992
die führenden Vertreter
der Demokratischen Partei Kurdistan-Iran DPKI

DR. SADEGH SHARAFKANDI
FATTAH ABDOLI
HOMAYOUN ARDALAN

und der in Berlin lebende Politiker

NOURI DEHKORDI

ermordet durch die damaligen Machthaber im Iran
Sie starben im Kampf für Freiheit und Menschenrechte

تابلۆی یەرەوەریی شەهیدانی بێرلین ٢٠ی ئاوریلی ٢٠٠٤

وێنەی ئەو هەشت کەسەی کە لە تەقاندنەوەی ئاوەندی جوولەکەکان لە "بوینێس ئایرێس"ی ئارژانتیندا دەستیان هەبووەو
حوکمی گرتنیان لە لایەن دادوەری دادگای ئارژانتینەوە دراوە.

شەهیدان دوکتور سەعید، هومایون ئەردەڵان و فەتاح عەبدوڵی

لە راستەوە: لەتیف حاجیکانی، خدر نەلماسی، فەریق حەسەنزادە، لوقمان میهفەر، د.سادق شەرەفکەندی، شەهید حەمزە بێهنام، شەهید سەتار جەلالی

بە دانیشتنەوە: شەهید عوسمان رۆنیان و شەهید مستەفا مونمێن پوور ـ ساڵی ٧٠ ـ نینزی

لە راستەوە: شەهید مەلا خالید عەزیزی، دوکتور سەعید، محەممەد وەلەدبەیگی، رەسووڵ قورغی و ماموستا مەلا عەبدولرەحمان لاهیجانی ـ ١٣٧٠ ـ نینزی

سەرانی کۆماری ئیسلامیی ئێران کە لە سەر قەتڵی دوکتور شەرەفکەندیو هاوڕێیانی لە دادگای میکۆنۆوسدا بە بڕیاردەرو تاوانباری سەرەکی ناسێندران.

## سەرچاوەکان

سەرچاوە کوردییەکان

١ـ د. محەممەد ئەحمەد گەزنەیی، ئیرهاب لە فیقهی ئیسلامدا، هەولێر، ٢٠٠٤

٢ـ د. احمد محەممەد رفعت، د. سالح بەکرنەلتەبیار، وەرگێڕانی کوێستان جەمال، شوێنی چاپ سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٣ ، ل١١

٣ـ هەژانی دنیا، وەرگێڕانی رێبوار کەریم وەلی، ٢٠٠٢

٤ـ نەریمان تالیب موریاسی، نرخی ئازادی، هەولێر، ٢٠٠٥

٥ـ بەڵگەنامەکانی کۆنگرەی حەوتەمی١٣٦٤

٦ـ کریس کۆچیرا، مێژووی کورد لە سەدەی نۆزدە تا بیست، وەرگێڕانی محەممەد ریانی، ١٣٦٢

٧ـ دوکتور سەعید شەرەفکەندی، گوڵبژێرێك لە وتارەکانی، بلاوکراوەی حیزبی دێموکرات، ١٣٨٣

٨ـ عوسمان خواکەرەم، بەچکە شێرانی کورد

٩ـ دوکتور عەبدولرەحمان قاسملوو، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی عەبدوڵلا حەسەن زادە، ١٩٧٣

١٠ـ دوکتور عەبدولرەحمان قاسملوو، چل ساڵ خەبات لە پێناو ئازادی دا، ١٣٦٤

١١ـ عەبدوڵلا حەسەن زادە، نیو سەدە تێکۆشان، ١٩٩٥

١٢ سەلام عەزیزی، سەفەری بێ گەڕانەوە، ١٩٩٢

١٣ـ دوکتور عەبدولرەحمان قاسملوو و عەبدوڵلا حەسەن زادە، کورتە مێژووی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران، ٢٠٠٢

سەرچاوە فارسی‌یەکان

١ـ مهران پاینده، عباس خداقلی، حمید نوذری، هنوز در برلین قاضی هست، نشرنما، ٢٠٠٠،آلمان، اسن

٢ـ قانون اساسی ایران، مصوب ١٣٥٨ شمسی
٣ـ د. محمدرضا ضیائی بیگدلی، حقوق بین‌الملل عمومی ١٣٨١
٤ـ د. هوشنگ شامبیاتی، حقوق جزای عمومی، ١٣٧٦
٥ـ غلامرضا علی بابایی، فرهنگ علوم سیاسی، تهران، ١٣٦٥و١٣٦٩

سەرچاوە عەرەبیەکان

١ـ قانون دولی‌عام

سەرچاوەکانی رۆژنامەو گۆڤارەکان

١ـ رۆژنامەی "کوردستان"، ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەنـدیی حیزبـی دێمـوکراتی کوردسـتانی ئێران، ژمارەکانی ٢٣١، ٢٤٥، ٢٣٢، ٢٣٢، ، ٤٣٥،٢٤٤.
٢ـ گۆڤاری "یاسا پارێز"، ژمارە ٦ چاپی ٢٠٠٠، ژمارە ٧ چاپی ٢٠٠١، ژمارە ٨ چـاپی ٢٠٠٣.
٣ـ سـند افشـاگرانە سـازمان اطـلاعـات داخلـی آلمـان در رابطـە بـا دادگـاە میکونـوس ١٩٩٣/٦/٢٩.
٤ـ روزنامەی آرش شمارە ٣٦ - ٣٧ سـال ١٣٧٣.
٥ـ روزنامەی انقلاب اسلامی شمارە ٣٣٢/ ٩ تا ٢٢ اردبهشت ١٩٩٤.
٦ـ روزنامەی کیهان شمارە ٥٩٢، پنجشنبە اول فیوریە ١٩٩٦ صفحە ١٢.
٧ـ گۆڤاری یاسا، سلیمانی، ژمارە ٦و٧و٨
٨ـ گۆڤاری تەرازوو، هەولێر، ژمارە ٢٠ و ٢١
٩ـ گۆڤاری مافپەروەران، سلێمانی، ژمارە ١٥
١٠ـ زنجیرە بەرنامەیەکی رادیۆ فەردا بە بۆنەی سێزدەهەمین ساڵرۆژی تیرۆری دوکتور سـادق شەرەفکەندی و هاورێیانی.

